کورتە مێژووی

# گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسی

وەرگێڕانی فەرشید شەریفی

سلێمانی
2005

# کورتە مێژووی
# گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسی

سلێمانی- 2005

نووسینی: بۆتول

وەرگێڕانی: فەرشید شەریفی

وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەرێتی خانەی وەرگێڕان
www.roshnbiri.org
khanaywargeran@yahoo.com

دەقی کتێبەکە بە فارسی

تاریخ مختصر تحولات جامعه شناسی ـ بوتول ـ ترجمه :م.وکیلی ـ
انتشارات صفی علیشاه ـ تهران ـ1347هـ.ش


- ناوی کتێب: کورتە مێژووی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسی
- نوسینی: بۆتول
- وەرگێڕانی: فەرشید شەریفی
- تایپ و دیزاین: سازان عومەر
- بەرگ: فەرهاد مەلا حەسەن
- زنجیرە: (111)
- تیراژ: 1500 دانە
- ژمارەی سپاردنی ( 306 ) وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە
- چاپخانەی: شڤان

## بەرایی

کۆمەڵناسی (سۆسیۆلۆژی) وەك یەكێك لە گرنگترین لقەكانی زانستی كۆمەڵایەتی، دەورێكی یەكجار گرینگی لە پێشكەوتن و ئاگایی مرۆڤدا بینیوە و دیارە تا زیاتر لێكۆڵینەوەی لەسەر بكرێت و پێوەی سەرقاڵ ببین، رۆشنگەری و گەشەسەندنی رای گشتیش زیاتر دەستەبەر دەكرێ و مرۆڤیش زیاتر وخێراتر لە ئامانجە ئایدیالەكانی نزیك دەبێتەوە. كۆمەڵگای كوردیش وەك كۆمەڵگایەكی ئینسانی لەو بوارەدا پێویستی بە گەشەكردن و پێشكەوتن هەیە، هەربۆیە خۆ خەریك كردن بە هەموو لقەكانی زانستەوە، پێویستییەكی حاشا هەڵنەگرەو دەبێ بەخوێندنەوەی ئاسەوارە گرنگەكانی هەموو كۆمەڵگا مرۆییەكان، ئەو رێگایە لەخۆی هەموار بكات. بەڵام بەداخەوە لەم رووەوە بۆشاییەكی یەكجار گەورە بەدی دەكرێت و كورد تا ئێستا ئاورێكی ئەوتۆی لە هزر و ئەندێشە جیهانییەكان نەداوەتەوە (هەر چەند هەندێ تەقەلا دراوە، بە تایبەت لەمساڵانەی دواییدا) و كەوتە دەبێ ئێمەش وەك ئەندامێكی ئەم جیهانە گەورەیە، كە ئێستا بە هۆی تەكنۆلۆژی و پێشكەوتنی زانست بە هەموو لایەنەكانیەوە، وەك گوندێكی بچووكی لێهاتووە، لە خوێندنەوەو لێكۆڵینەوە و ئاوتوێكردنی ئەندێشە و قوتابخانە فیكرییەكانی جیهان غافڵ نەبین. هەرهەمان هەست كردن بەو بۆشاییە و هەروەها گرنگایەتی یەكجار زۆری زانستی كۆمەڵناسی، نووسەری ئەم چەند دێرەی هان داوە لە درێژەی كارەكانی وەرگێرانیدا ئەو كتێبەی لە بەردەستاندایە وەربگێرێتەوە سەر زمانی كوردی، بەو هیوایەی كەلێنێك پڕ بكاتەوە و لە رۆشنگەری و خستنە

سەر زانیارییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگای کوردی، ڕۆڵێکی هەر چەند بچووک بگێڕێت.

شایانی باسە بۆ ئاگاداری زیاتری خوێنەرانی هێژا، لە کۆتایی کتێبەکەدا لیستەیەك لە هەندێ لەو وشەو زاراوانە و هەروەها ناوی ئەو کەسایەتی و بیرمەندانەی کەلە ناو بابەتەکاندا هاتوون و باسیان لێکراوە، تەرتیب کراوە و خوێنەر دەتوانێ لە کاتی پێویستدا بۆیان بگەڕێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ دراوە بۆ هەندێ لەو وشانەی کە ڕەنگە بۆ خوێنەر نامۆبن، یاخود بۆ ئاگاداری زیاتر، هاوتای فارسی و ئینگلیزییەکانیشیان دابنرێت. دیارە ئەو وشانە مانای لەوە زیاتریشیان هەیەو ڕەنگە وشەیەکیان هەبێ چەندین مانای جۆراوجۆری هەبێت، بەلام ئێمە زیاتر ئەو واتایەمان بۆ نووسیوەتەوە کە لە ناواخنی بابەتەکانی ئەم کتێبەدا مەبەست بووە. دیسانەوە چەند وشە و زاراوە و کەسایەتیشمان هێناوە کە لە دەقی کتێبەکەدا نین بەلام لەبەر ئەوەی پێوەندی ڕاستەوخۆیان بە بابەتەکانەوە هەبوو، بە پێویست زانرا دابنرێن.لە دواییشدا سوپاسی کاك شۆڕش جوانڕۆیی ئەکەم کەئەم کتێبەیان پێ ناساندم و هانیان دام وەری بگێڕمەوە بۆ کوردی.

فەرشید شەریفی ــ پاوە 2003

## بەشی یەکەم

# سەردەمی دێرین و چاخەکانی ناوەڕاست

گرنگترین پێشکەوتنەکانی زانستی دەربارەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، لە سەردەمە پڕ قەیرانییەکان، یان لە کاتی تێڕامان لە سەر قەیرانێکی تایبەت هاتوونەتە ئاراوە. واتە: کاتێك کەڕووداوەکان لەچوارچێوە ئاساییەکانیان تێپەڕیوە، ڕێگا چارە گەلی ئاساییش هیچ کاریگەرییەکیان لە سەریان نابێت. چوونکە بە شێوەیەکی خۆڕسك تەنها چاومان لە گۆڕانکارییەکانەو لەناو دەزگایەکی بێ جموجۆڵ و چەق بەستوودا، شتێکی ئەوتۆ، سەرنجمان بەرە ولای خۆی ڕاناکێشێت. لە کاتێکدا ئەوە ڕووداوو بارودۆخە پێشبینی نەکراوەکانن کەمنەبنە هۆی ئەندێشەو داهێنان و ئاڵ و گۆڕی فیکری. کۆمەڵناسی تەنها زانستێکە کەمەر لەسەرەتای دەرکەوتنییەوە، بەردەوام لە سەر شتومەکە بگۆڕەکاندا لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی کردووە و هەموو قۆناغە گرنگەکانیشی بەهۆی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتییەوە هاتوونەتە ئاراوە. بەڵام ئەوە بەتەنها بەس نییە کە قەیرانێك ڕوودات و بە ئاسانی پێشکەوتن بەدەست بێت. مەرجی بیرکردنەوەی سۆسیۆلۆژیك، هەبوونی گرووپگەلی فەرهەنگی و "فەزایەکی ڕۆشنبیرانە"یە کە لەسەر ئەو گریمانانەی کە هەڵقوڵاوی تافیکارییەکانن بکۆڵنەوەو، جیالەوەش ئارادەیەك لە ئازادی فیکری بەهرەمەندبن، ئەگینا ملکەچی ڕەوتێکی داخراوو بەدوادا چوونێکی زۆرەملانە دەبن و ناتوانن هیچ ڕەخنە، یان تیۆرێکی داهێنەرانە بهێننە ئاراوە.

بارودۆخێکی لەو جۆرە ـ کاتێ کەلە سەردەمی پڕ لە ئاژاوەی شەڕەکانی "پلۆپۆنز"دا قوتابخانە گەورە فەلسەفییەکانی سۆفستاییەکان، ئەرەستوو، ئەفلاتوون و.... دەرئەکەوتن؛ بۆیەکەم جار لە یۆناندا هاتە ئاراوە.

## كۆمەڵناسي نهێني

هەموو كۆمەڵگايەك جۆرەكۆمەڵناسييەكى نهێنى تێدايە كە بايەخى يەكجار كەمى پێ ئەدرێت و بەدەگمەن ناوڕى لێ دەدرێتەوە. ئەم جۆرە كۆمەڵناسييە تەنانەت لە ناو سەرەتاييترين ڕێكخراوەكانيشدا و هەروەها لەناو ناشارستانيترين و بەرتەسك ترين گرووپە نينسانييەكاندا، بە شێوەيەكى نهێنى گونجێندراوە. پێدەچێت داب و نەريت، مافەكان (ياساو حوكمەكان)، ڕێكخراوە بنەماڵەيى و كۆمەلايەتييەكانى هەر كۆمەڵگايەك، كەم تازۆر، ڕاستەوخۆ بە هۆى هەندێك لە "بديهيات" و پرەنسيپەكانەوە هاتبێتنە ناراوە. كەواتە، يەكێك لە ئەركە بنەڕەتييەكانى كۆمەڵناسى و مێژوو، جيا كردنەوەى ئەو پرەنسيپانەيە لەو كۆمەڵە بابەتانەى كە لێكۆڵينەوەيان لە سەر ئەكەن.

### بيركردنەوەي مەيلەو كۆمەڵناسي و بيركردنەوەي پاساو دەرانە

گەڕيدە و مێژوونووسە يۆنانييەكان، تا ڕادەيەك ڕۆژهەلاتى دێرين و ڕێكخراوە كۆمەلايەتييەكانيان بۆمان وەسف كردووە، لە ڕوون كردنەوەكانياندا وادەرئەكەوێت، كە ئەنديشەو پێداويستييە مەزهەبييەكان، لە ژيانى خەڵكى ئەو ناوچانەدا گرنگييەكى زۆريان هەبووە. بۆ نموونە "هيرۆدۆت" ئەوە پيشان ئەدات كە نايدۆلۆژياى ميسرييەكان، پاساوى دەهێنايەوە بۆ ئەو ڕێكخراوە كۆمەلايەتييانەى خۆيان كە لە سەر بناغەى مەزهەب دامەزرابوون. زنجيرەى پلە و پايەى خواكان، وەك زنجيرەى پلە و پايەى تاكەكانى كۆمەڵگا و ئافراندنى سەرزەمينى ميسر، فەرمانێكى ئيلاهى بوو و فيرعەونيش كە بە پێوەندگەى نێوان دوو جيهان لە قەڵەم ئەدرا، بۆخۆى خوايەك بوو. سەرەنجام، ژيانى دواى مردنيش درێژەى هەمان ژيانى دنيايى بوو. ئەم باوەڕەى دوايى، گرنگايەتى تەرم و مۆميايى كردن و هەروەها فەراهەم كردنى هەموو ئەوكەرەسانە لاى ميسرييەكانمان بۆ دەرئەخات كە بۆ ئاسايشى ژيانى دواى مەرگ پێويستن. ئەم چەمكە تەواو ماددييەى ژيانى دواى مەرگە، كارێكى واى كردووە كە دێرينناسان بتوانن

ژیان و ئەندیشەی میسرییەکانی سەردەمی دێرین، باشتر لەو کۆمەڵگانەی کە لە ناوچوون، وێنا بکەن.

کۆمەڵگا هیندووەکان، تەنانەت دێرین ترینیشیان، فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتییان هەیە کە وابەستەبە باوەڕە مەزهەبییە برهماییەکانن. ئیۆلۆژی (زانستی خواناسی) هێندووش، سەرەڕای هەموو کۆت و بەندی نەفسانە و خورافەکانی، لەو ڕووەوە کە دەرئەنجامی باوەڕە کۆمەڵایەتییەکانە، بە بەشێك لە راستییە کۆمەڵایەتییەکان ئەژمێردرێت. سیستمی سەندیکایی، بناغەی سەرەکی ئەو کۆمەڵگانەیە کە، فەلسەفەی برهمایی تیایاندا بەرەوی هەیە. ڕوون کردنەوەو ڕاڤەکارییە جۆراوجۆرەکانی هێندووەکان، سەبارەت بەبوونی سەندیکاکان و ئەو ئاکامانەی کە لێیانەوە بەدەست دەهێنن، سیستمێك دەهێنێتە ئاراوە کە ئەتوانین بە باشترین شێوە لە سەر بنەمای مەزهەبی و سیمبۆلیك و لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ پرەنسیبە مادی و پێشەییەکاندا بیگونجێنین.

هەروەها چەمکگەلی سۆسیۆلۆژیك لە ناو ئەو پرەنسیب و باوەڕانەی کە بەسەر دەزگاکانی کۆمەڵگا گرنگەکانی ئەمریکای بەر لە "کریستۆف کلۆمب"دا زاڵ بوون، زۆر سەرنج ڕاکێشن.

ڕەنگە ڕەهەندی بنەڕەتی و تایبەتی کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکانیش، لەم مەسەلەیەدا بێت کەئەتەنها دەزگا کۆمەڵایەتییەکانیان لە سەر بنەماگەلی مەزهەبی دامەزرابوو، بەڵکوو ئەم دەزگانە بەدرێژەی راستەوخۆی جیهانێکی باڵاتر لە قەڵەم ئەدران. پاشایەکی پیرۆزیش، پێوەندی نێوان دوو دنیای دابین دەکرد و لە هیندستان دا ڕۆڵێکی لەو جۆرە، لەئەستۆی سەندیکا برهماییەکاندا بوو. تەنانەت لە فیۆدالیزمی راسیۆنالیستی چینی کلاسیکدا، ئیمپراتوور، کوڕی ئاسمانەو، لە ژاپۆندا میکادۆ بەخوا ئەژمێردرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بیرمەندە کلاسیکەکانی چین، زیاتر بیریان لە مەسەلە

کۆمەڵایەتییەکان نەکردەوە، بەڵام لە فازانجخوازییەکی (utilitarisme) سنووردارو جۆرە بیرکردنەوەی بێ بەزەییانە بەرانبەر ئازاری تاکەکان و بە تایبەت ژنان، تێیان نەپەڕاند، کە ئەو بیرکردنەوەشیان بە هۆی کەمتەرخەمییانەوە بوو.

کەواتە بەمەبەستی پێکهاتنی کۆمەڵناسی، تێڕامانێکی سۆسیۆلۆژیک کە بەلانی کەمەوە، تا ڕادەیەك دوور لە کۆت و بەندگەلی مەزهەبی بێت، بە شتێکی پێویست دەزانرێت. لایەنی تایبەتی سیتە[1] (cité)مەکانی یۆنان، بریتی‌یەلە وێکچوونی باوەڕگەلی مەزهەبی و شان بەشانی ئەوەش، ناکۆکی لە نێوان ڕێکخراوە سیاسییەکانیاندا. بوونی کۆمەڵگاگەلێکی جۆراوجۆری لەوجۆرە کە مافی بڕیاری چارەنووسیشیان هەیە ــ واتە سیتەسەرەکییەکانی یۆنان ـــ وەك پێویست سەرنجی ئەو کەسانەی کە بەیەکەم دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسی لە قەڵەم نەدرێن، بەرەولای خۆی ڕاکێشا.

## دامەزرانی کۆمەڵناسی‌یەکی ئیستدلالی

### سۆفستایەکان

یەکەمین فەیلەسووفانی یۆنان کە سەرقاڵی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان بوون، سۆفستاییەکان بوون. ئێمە زۆرتر بەهۆی نووسراوەکانی لە ڕووی نووسینی نەیارەکانیانەوە، ناسەوارەکانیان دەناسین. بیروڕای سۆفستاییەکان هەر لە ئەفلاتوونەوە تا ئەریستۆفان تەنها بە مەبەستی ڕەخنەلێگرتن و گاڵتە پێکردن، باسیان لێدەکرا! بەڵام ئەو ئەندیشانەی کە خراونەتە پاڵیان، هەر چییەك بن، ئەوە مەسەلەیەکی ئاشکرایە کەتەنها ئەوان بوون کە بۆ یەکەم جار دەرکیان بەگرنگایەتی میتۆدی زانستی لە بواری مەسەلە کۆمەڵایەتییەکاندا کرد. واتە؛ تێڕوانین و بۆچوون، بەراوردکردن و ڕەخنە گرتن. سۆفستاییەکان، ئیستدلال گەلی

ئاسایی، ئەفسانە و خورافەو بەوتەی بیکەن Idola –Tribus یان پەسەند نەئەکرد و پاشماوەی باوەڕە کۆنەکانیان بە شتێکی بێ بایەخ دائەنا. هەر چەند سەرەڕای گەشەکردنی فراوانی بازرگانی و فیکری ئەسینا، لە ناو ڕێکخراوە کۆمەلایەتییەکانی ئەم سیتەدا بوونیان هەبوو. بناغەی بیروڕاکانیان، دۆزینەوەی یاسایەکی سرووشتی بوو کە لە سەربنەمای ڕێزلێنانی تاکەکانی مرۆڤ ڕاوەستابوو. سۆفستاییەکان، پشتیوانییان لە تاکێك ئەکرد کە لە کۆمەلگا دێرینەکاندا بە تەواوەتی ملکەچی سیتەبوو و ئەیانەویست لەم وابەستەییە ڕزگاری بکەن. لایەنێکی مۆدێرنی دیکە ئەوەیە کە، هەموو بیرکردنەوە و توێژینەوەکانیان هەلقولاوی ئەندیشە گەلی ئاکاری (ethique) بوون. واتە یەکسانی خواز بوون و لەگەل کۆیلەتی و ناسیونالیزمی تەسك بینانەی سیتەکانی یۆنان دا دژایەتییان ئەکرد و تا پێش ئەو سەردەمە مێژووییە، هیچ مەسەلەیەك بە گوستاخی و ئازایەتییەکی لەو جۆرە ــ کە دواتر بوو بە شتێکی تایبەتی نوخبە یۆنانییەکان ــ نەخرابووە بەر لێکۆلینەوەوە. ئەم گوستاخی و ئازایەتییەش، لە شوێنێکدا کە فەلسەفە ڕوخسارێکی پێچەل پێچ و ئالۆزی هەبوو، شتێکی ئیجگار ناناسایی بوو. سەرەنجام ڕەخنەگران و سۆفستاییەکان سەرنجی بیرمەندانیان ورووژاند و خستیانە پال دیاردە کۆمەلایەتییەکانەوە.

## ئەفلاتوون (429-347پ.ز)

پوختەی بیروڕاکانی ئەفلاتوون لە ناو ئاسەوارێکی سیاسیدا بە ناوی "کۆمار" کۆکراونەتەوە، کە سیستمێکی دیاردەی فەلسەفەی کۆمەلایەتی ڕوون ئەکاتەوە. ئەم سیستمە بە شێوەیەکی "نۆرماتیڤ" ڕێك خراوە. واتە؛ ئاراستەکەی بە شێوەیەکە کەئەتوانرێ بە تێزێکی کۆمەلایەتی لە قەلەم بدرێت. ئەو، بە شێوەیەك پێناسەی "سیتە" ئەکات کە ئەبێ ببێت، نەك بەوجۆرەی

که هەیە. ئەفلاتوون زۆر بیر لەو مەسەلەیە ئەکاتەوە کە چۆن دەتوانین لە ئاژاوەگێڕییە سەخت و ترسناکەکان، وەك ئەو شڵەژاوێتییەی کە لەو سەردەمەدا وڵاتەکەی داگرتبوو، خۆمان بپارێزین. لێرەدا بە پێی قسەکانی خودی ئەفلاتوون، دەبێ ڕێکخراوەکانی سیتە بە شێوەیەکی نەگۆڕو عەقڵانی ڕێك بخرێن.

دەتوانین بڵێین لە ئەفلاتوون بەولاوە، لایەنی تایبەتی فەلسەفەی کۆمەڵگا ئەوەیەکە ئاژاوەگەلی جۆراوجۆر و هەروەها هیوایەت بە باشتربوونی دەرەنجامەکانیان، ئەبێتە هۆی وروژاندن و کامڵ بوونی کۆمەڵگا. ئەفلاتوون بۆخۆپاراستن لە بێ نەزمی، گەڕانەوە بۆ ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە کۆنەکانی یۆنان بە پێویست ئەزانێت. ئەو نموونە زیندوویەی کە دەستنیشانی دەکا، بناغەی حکوومەتی ملهوڕانە و ئەریستۆکراتییانە وسەربازییانەی "ئسپارت"ە. بەبیروڕای ئەو، ئەبێ پێوەندی نێوان سیتەکان کەمتر بێت و بەرانبەر بەڕۆشنبیرانیش هێندە ڕەشبینە کە شاعیران وەك هۆکاری هەیەجان و نۆێخوازی ڕەت ئەکاتەوە و لەسیستەمی سەندیکایی پشتیوانی ئەکات و لە ئاکامدا، بۆ خۆپاراستن لە ناهاوسەنگی ئابووری و سیاسی، ژمارەی دانیشتوانی "سیتە"ی نموونە، کەبە هیچ شێوەیەك نابێ لەوە تێپەڕێت، دەس نیشان ئەکات و لەو باوەڕەدایە کە بەرپرسان، بە مەبەستی ڕاگرتنی ژمارەی جەماوەری خەڵك و پڕکردنی ئەو بۆشاییەی کە بە هۆی جەنگ و نەخۆشی و کارەساتەکانیتر هاتۆتە ئاراوە، ئەبێ ژمارەی ئیزدواجەکانیش دەس نیشان بکەن. تەنانەت لەوەشی تێپەڕاندووە و ئەڵێ ئەو کەسانەی کە تەمەن و هەل و مەرجی لەباری یاساییان نییەو منداڵیان ئەبێ، ئەبێ سزا بدرێن.

سپیناس دەڵێ: "ئەفلاتوون ئایدیالیستترین و لە هەمان کاتیشدا، ریالیستترینی تیۆرسیەنە سیاسییەکانە." سۆسیۆلۆژی ئەفلاتوون، لە سەربناغەی رەوانناسی ئەو راوەستاوە و بناغەی رەوانناسییەکەشی، لێکۆڵینەوەیە لەسەر داخوازە چالاکە رۆحییەکانی مرۆڤ. بە رای ئەفلاتوون رۆحی مرۆڤ لە سێ شت پێك هاتووە: دڵ، عەقڵ، حەز (حەز لە شتومەکە مادییەکان).

لەم پێوەندییەدا سەقامگیر بوون بریتییە لە هاوسەنگی نێوان ئەوسێ داخوازە. (واتە، سەقامگیربوونێك کە بەرگری لە تەقینەوە و رقەبەرایەتییەکان ئەکات)وە ئەم هاوسەنگییەش، هەڵقوڵاوی سێ خەسڵەتی بنەڕەتییە کە لەگەڵ ئەو داخوازانەدا تەبان، واتە، "اعتدال"، ئازایەتی و لێهاتوویی.

پێویستە ئەم هاوسەنگییە رۆحییە لە ناو کۆمەڵگادا رەنگ بداتەوە و کۆمەڵیش وەك رۆحی مرۆڤ، لە سێ سەندیکای کاسبکاران، جەنگاوەران، دادوەران و فەیلەسووفان پێك بێت. بە پێچەوانەی کۆمەڵگای فیوٚدالی، کە تیایدا چینی دەسەلاتداری نەجیب زادە و رۆحانییەکان، هاوکات بە فێودالی گەلێکی گەورەش لە قەڵەم ئەدرێن، ئەفلاتوون مافی موڵکایەتی بۆ کاسب کاران بەرەوا ئەزانێت و هەروەها چینە باڵاکان بەمەبەستی دابین کردنی برایەتی و دڵپاکی لەناوخۆیاندا دەبێ جۆرە "کۆمۆنی‌تاریزم[2]"ێك بخەنە بواری جێبەجێ کردنەوە و تەنانەت ئەم سیستەمە، بنەماڵەکەی خۆیانیش بگرێتەوە، واتە نەبێ ئیزدواجەکانیان هەمیشە بە شێوەی کاتی بێت و بە تەواوەتی لە لایەن دادوەرانەوە دەس نیشان بکرێت و منداڵەکانیشیان پێکەوە، برایانەو بەبێ ئاگاداری دایك و باوکانیان پەروەردە بکرێن و رابهێنرێن. بەم جۆرە ئەفلاتوون، جیاوازییەکی تەواودەخاتە نێوان حاکم و موڵکدارەکانەوە.

هەروەها ئەفلاتوون تیۆرێکی ناوەزمەندانەی بۆ ئاژاوەگێڕی و شڵەژاوێتییە کۆمەڵایەتییەکان خستۆتەڕوو. بە بڕوای ئەو، ئەم ئاژاوە گێڕییانە، هەڵقوڵاوی سەردەمە سیاسییە دوابەدوایەکانە، کە پێش هەمووشتێك هەڵقوڵاوی بەرەنگاری سایکۆلۆژیکی وەچەکانە لەگەڵ یەکدیدا. هەروەها پێی وایە، گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، بەهۆی دەسەڵاتداری ناوبەناو(متناوب)ی هەندێ لە گرووپە سایکۆلۆژیکە هەمیشەییەکانەوە هاتوونەتە ئاراوە کە بریتین لە، دادپەروەران، پلەو پایەخوازان، پلۆتۆکراتەکان[3]، چەوسێنەران وملهۆڕان. ئەفلاتوون نێوان رۆحییەی دەوڵەت و تاکەکان، پێوەندییەکی مەنتیقی بەدی ئەکات: "وەك چۆن دڵی ئینسانەکان جیاوازییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە، حکوومەتەکانیش جیاوازن. کەواتە جۆرەکانی هەرشتێك هەر چەندە بێت، جۆرەکانی تریش هەر ئەوەندەیە".

## ئەرەستوو (384-322پ.ز)

بیروراکانی ئەرەستوو ئەرەونیان ترن لە ئەندیشەکانی ئەفلاتوون و لە هەمان کاتدا واقیع بینانەترو عەقڵانیتریشن. ناسەوارە سیاسییەکەی ئەرەستوو لەم بوارەدا کتێبێکە بەناوی "سیاسەت" کە تیایدا، رێکخراوی سیاسی و داوودەزگا کۆمەڵایەتییەکانی هەموو "سیتە"کانی یۆنان و هەندێ لەو جۆرە حکوومەتانە، بە تایبەت "کارتاژ" بە شێوەیەکی گشتی و قیاسی ئەخاتە بەر راڤە و لێکۆڵینەوە.

ژمارەیەکی زۆری راوبۆچوونە سۆسیۆلۆژیکیەکانی ئەرەستوو، فۆرمێکی کلاسیکیان لەخۆگرتووە. لە هەموویان گرنگتر ئەم پرەنسیبەیە کە ئەڵێ: "مرۆڤ ئاژەڵێکی سیاسییە". واتە هەرگیز بەبێ ژیانی کۆمەڵایەتی نابێت. مرۆڤ بۆ مانەوە و پاراستنی ژیانی و هەروەها کامڵ کردنی ئایدیاکان و ئەو هێزە ناکارییانەی کە دوا

ئامانجیەتی، ناتوانێت بە تەنهایی هیچ کارێك بكات و بوونی خۆی بسەلمێنێت. ئەرەستوو پێ لەسەر کاریگەرێتی "ناو و هەوا" لە سەر سیکۆلۆژی کۆمەلایەتی دادەگرێت. هەروەهابنەماڵە بەباشترین گرووپی سەرەکی کۆمەلگا دەزانێت و هەر لێرەوە بیروڕاکانی ئەفلاتوون رەت نەکاتەوە. چوونکە ئەفلاتوون، بنەماڵە بە تێکدەری ئەو یەکگرتوویییە لە قەلەم ئەدا، کە دەبێ لە ناو هەموو ئەندامانی سیتەیەکداهەبێت و ئەیویست لە یۆتۆپیاکەی خۆیدا لە ناوی بەرێت.

باوەرگەلێکی بنەرەتی تریش کە دواتر هەموویان بوون بە ئیلهام بەخشی ڤوتابخانــە جۆراوجـۆرە سۆسیۆلۆژیکەکان، لە ناو ئاسەوارەکانی ئەرەستوودا بەدی دەکرێن. گرنگترینیان ئەمانەن: ئەرەستوو کۆمەلگا بە بوونەوەرێکی زیندوو ئەشوبهێنێت کە گرێدراوە بە یاسای زاوزێ و پێگەیین و مەرگەوە. ئەو، لەو باوەرەدایە کە گۆڕان و وەرگۆڕان، شتێکی پێوستە بۆ ژیانی کۆمەڵ. کۆمەڵ لە توخمگەلێکی ناوێکچوو پێك هاتووە کە هەمان ئەو توخمانە، پێك هێنەری پلەو پایەو دەوڵەت و دابەش کردنی کاریشن. ئەم حاڵەتە سیستمێکی هاوسەنگ ئەهێنێتە ئاراوە و ئەم هاوسەنگییە کاتێك لە ناو دەچێت کە:

1ـ یەکێك لە توخمەکانی سیتە لەڕووی ژمارەوە لەچاو توخمەکانی دیکەدا، زیاتر گەشە بکات، یا...

2ـ رادەی جەماوەری خەلکی بەگشتی، بە شێوەیەکی بەرچاو زیادبکات. لەو حاڵەتەدا، بەوتەی ئەرەستوو، ئیدی ڕێکخراوە کۆنەکان بەکەلکیان نایەن، چوونکە هەر ڕێکخراوێك دەبێ لەگەڵ ژمارەی جەماوەرکەیدا تەبابێت بەپێچەوانەشەوە.

ئەرەستووش وەك ئەفلاتوون و بەگشتی وەك سوقراتییەکانی دیکە، هەمیشە ترسیان هەبوو لەوێرانکاری و بێنەزمی گەلێك کە

له سەردەمی ئەودا، زۆرجار سیتەکانی یۆنانیان ئەشلەژاند. ئەو ئەم شلەژاویتییەی بە هەڵقوڵاوی نالەباربوونی بارودۆخ لە قەڵەم ئەداو لەو باوەڕەدا بوو کە یاسا دەبێ هەوڵ بدات چاکسازی تیابکات. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێکخراوێکی یەکسانیخوازی لەوجۆرە، تەنها بەدرێژە پێدانی زاوزێ و وەچەخستنەوەوە لە تواناد ابوو. بەوتەی ئەو، ئەگەر بیانەوێت سەروەت و سامان و ئیمکانات کەم بکەنەوە، دەبێ ڕادەی زاوزێش کەم بکەنەوە، ئەگینا ناهاوسەنگییەکی دیکە دێتە ئاراوە. لە ئاکامدا، چینێکی هەژار سەر هەڵئەدات و ناتوانرێ رێ لە شۆڕش کردنیان بگیردرێت[4].

ئەرستوو کە زۆربەی کات باوەڕی بە ئازادی هەمەلایەنەی ئاکاری هەیە، بە پێچەوانەوە، یەکجار سەختگیرانە و مل هۆڕانە لەگەڵ مەسەلەی جەماوەرو ژمارەی دانیشتوان هەڵس و کەوت ئەکا. ئەو تەنانەت تەمەنی زاوزێ کردنیشی دەس نیشان کردووە و بۆ هەندێ بارودۆخ بەشتێکی ئیجباری لە قەڵەم ئەدات و بۆ هەندێ بارودۆخی دیکە، قەدەغەی ئەکات و ئەمر بە لەبارخستنی منداڵ ، یان منداڵ کوژی ئەکات. سەرەنجام لە ڕوانگەی سایکۆلۆژییەوە، بە بیروڕای ئەرەستوو، بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی، هاوبەشی و هاوڕایی بیرو هزرەکانە کە خۆی لە خۆیدا ئەبێتە هۆی هاوکاری کردنی ئیرادەی تاکەکان لەگەڵ یەکدی دا. کەواتە، ڕاوێژکارییەك کە پێش لە بڕیاردانێکی بە کۆمەڵ ئەنجام ئەدرێت، لە ڕووی چییەتییەوە، لە ڕاوێژکردنێکی تاکەکەسی زیاتر، هیچ نیە. بەوتەی ئەرەستوو ڕادەی لێهاتوویی و عەقڵانییەتی تاکی کۆمەڵایەتی، گرێدراوە بەزۆرایەتی ئەندامانی کۆمەڵگا و فراوانێتی ئەزموونەکانیان..

## تووسیدید (نزیکەی 460ـ 395 پ.ز)

ئاسەوارەکەی تووسیدید "مێژووی جەنگی پلۆپۆنز" جگە لە گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان، هەندێ لایەنی گرنگتریشی هەیە. تووسیدید نەتەنها ڕووداو و کەسایەتییە گەورەکان ئەخاتەبەر ڕاڤە

و لێکۆڵینەوە، بەڵکوو هەوڵ نەدات بە ئیستدلالەوە باس لەڕووداوە مێژووییەکان بکات. ئەو، سەرجەم داخوازەکانی مرۆڤ و هەروەها هێزەکانی بەشدار لە شەڕی گرینگ و شڵەژاوی پلۆپۆنز ــ کە لە هەمان کاتیشدا بەهۆی وێرانبوونی یۆنانی دێرین بەدەستی خۆی، بە یەکێك لە خاڵەکانی دەسپێکردنی مێژوو لە قەڵەم ئەدرێت ــ ئەخاتە بەر ڕاڤە و لێکۆڵینەوە و لەم ڕووەوە لە راستیدا "مێژووی جەنگی پلۆپۆنز". بناغەی فەلسەفەی مێژووی دامەزراندوە.

## گرنگایەتی بناغەدانەرانی کۆمەڵناسی لە یۆناندا

ڕاڤەکردنی بناغەدانەرانی سۆسیۆلۆژی لە یۆناندا، گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە، چوونکە سەرجەم قوتابخانە سیاسی و سۆسیۆلۆژیکە دواییەکان، بەردەوام دەستەو یەخە بوون لەگەڵ ئەو هەڵوێست و داخوازانەی کە ئەوان دەسنیشانیان کردبوون. ئەفلاتوون، نوێنەری ویستە جیدییەکانە، واتە ئەوحەز و خواستانەی کە دژی ئازادی ئیختیار و ڕەسەنایەتین. بە بڕوای ئەو، تاك بەجەستەو ڕۆحەوە، سەربەسیتەیە. تەنانەت لەو بڕوایە دایە کە دەبێ بنەماڵە ــ کە لە روانگەی ئەوەوە، بەهۆی "ئەندیویدوالیزم" بوونیەوە، دژی ڕۆحی هاوبەشە ــ لە ناوببرێت. هەروەها دەوڵەت بە تەنها خولقێنەری ئاکارو ماف ئەناسێت و گەڕانەوە بۆ بارودۆخی بەرتەسکی ژیانی سادەو ساکاری سەرەتایی پێشنیار ئەکات و دژایەتی هەرجۆرە پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی تاکەکان ئەکات. بە بڕوای ئەو، زنجیرەی پلە و پایەکان دەبێ وەك سەندیکاگەلی بێ جموجۆڵ و هاوشێوەی ئەرکی دیاریکراوی کاربەدەستان، جێگیر و سەقامگرتوو بێت.

بەڵام ئەرەستوو بڕوای بە خواستێکی پێچەوانەی ئەوە هەیە. بە بڕوای ئەو، زانستی کۆمەڵ پێش هەموو شتێك زانستێکە کە

لەسەر بناغەی تیۆروانین دامەزراوە. کۆمەڵگاکان دیاردەگەلێکی زیندوون کە جووڵانەوە، سەرەکی ترین تایبەتمەندییانەو جیاوازی ژینگە و جۆری پێکهاتەیان نەبێتە هۆی فرەچەشنی و ئاڵۆزکاوێتییان.

## بیرۆکە سۆسیۆلۆژیکەکانی رۆمییەکان

سەردەمی بیرکردنەوە و تیۆرامانە بنەرەتییە سۆسیۆلۆژیکەکان، پاش ئەرەستوو تەقریبەن کۆتایی هات و شێوە بیرکردنەوەی یۆنانی، هەندێ شێوەی تری دەست پێکرد.

رۆمییەکان هیچ جۆرە باوەڕێکی تازەو گرنگی سۆسیۆلۆژیکییان نەهێنایە ئاراوە. بەلام داگیردنی ولاتگەلی دوورە دەست و توانای لێکۆڵینەوە لەسەر داب و نەریتی ڕێکخراوە کۆمەلایەتییەکانی گەلانی دیکە بۆ ڕۆمییەکان، وەك لێکۆڵینەوە لەسەر ژێرمەنەکان لە لایەن "تاسیت"و، زۆربەی کات، لێکۆڵینەوە سەبارەت بە "گلوا[5]"کان لە لایەن "سزار"ەوە، بوە هۆی ئەوە کە جۆری بیرکردنەوەی ڕۆمی، رۆڵێکی گرنگ لە بواری سۆسیۆلۆژی راڤەکارانەدا بگێڕێت. شێوە بیرکردنەوەی ڕۆمی زیاتر لایەنی پراکتیکی هەبوو. رۆمییەکان. وەکوو چینییەکان، ئاکارخواز گەلێکی گەورەی وەك "سیسرۆن" و "سینێك" یان هەبوە. بەلام لە هەمووی گرنگتر، ڕۆم، ئیمپراتوورییەکی راستەقینەی خوڵقێنەری مافە مۆدێرنەکان بوو و وردە وردە بناغە سەرەکییەکانی ئەو مافە مۆدێرنانەی، لەماوەی چەندین سەدە ئەزموون و پراکتیکدا، دارشت. بەم جۆرە ماق بەرتەسك و سەرەتایی جاران، گۆڕا بە مافێکی پراکتیکیتر و قووڵتر و پرمنسیب گەلێکی زۆری لێ دروست کرا کە دواتر وەك ماق خۆرسکی(فتری) ناودێر کران. ئالێرەوە دەتوانین دەرك بە گۆڕانی لەسەرخۆی بارودۆخی گشتی مرۆڤ و پێوەندییە کۆمەلایەتییەکان بکەین.بیروباوەڕگەلی زاڵ بەسەر ئەم پێوەندییانە، هەروەك وتمان، لە پلەی یەکەمدا جۆرە

سۆسیۆلۆژییەکی ڕاستەقینەیە و ئەم سۆسیۆلۆژییە، بە شێوەی شاراوە یا خود ئاشکرا، هەمیشە لە ژێرخانی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکاندا کە لە ڕاستیدا، حەقیقەتی سیستمی ئایدۆلۆژیکییەتی، بوونی هەیە.

## کۆمەڵناسی دووانە ( Dualiste )

### شۆڕشی مەسیحی

ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە دێرینەکان، لەڕووی کۆیلەدارییەوە، لەگەڵ ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی ئێستادا جیاوازییەکی زۆریان هەیە. کاتێك کە ئێمە سەبارەت بە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی دیموکراسیترین سیتەکانی یۆنان قسە دەکەین، نابێ ئەوەمان لە بیربچێت کە تەنها ژمارەیەکی یەکجار کەمی خەڵکی، لەو ڕێکخراوانە بەهرەمەند ئەبوون و کۆیلەکان، لە هیچ مافێکی کۆمەڵایەتی بەهرەمەند نەبوون. جیا لەوەش لەشارستانییەتە دێرینەکاندا، سیستمێکی ـ کەم تازۆر ـ وشك و بێڕۆح لە ئارادابوو کە هەنووکەش پاشماوەکەی لە ناو دانیشتوانی ئۆقیانووسیەو هەروەها ڕەش پێستەکانی ئەفریقا و هیندستاندا دەبینرێت. بەڵام "ئۆلترۆنۆم"[6] هەندێ ماف دیاری کردبوو کە لەچاو ئەوسوننەتەکانی ئەو سەردەمەی کە تیایدا دەژی، یەکجار مرۆڤ دۆستانەبوو.توندو تیژی کردن بەرانبەر ئاژەڵانی قەدەغە کرد و پرەنسیپەکانی یەکسانی خوازی پەرە پێدەدا و فەرمانی دا کە وردە وردە کۆیلەکان ئازاد بکرێن. بە پێی ئەو پرەنسیپانە، کۆیلەداری تەنها بە شێوەی "کاتی" ڕێی پێدرابوو. "سنت پۆل" ناسراو بە "حەواری نەجیبزادە"ش، هەندێ ئسووڵی خواپەرستی لە ناو ڕێوڕەسم و داب و نەریتی کۆنی جوولەکەکانەوە، وەك ڕێوڕەسمی قوربانی کردن و هەندێ خورافاتی دیکەش، هەڵێنجا. پەسەند کردنی مەسیحییەت، بە لە ناو بردنی نەسڵی زنجیرەی پلەوپایەی

خواکان، کە بە رەنگدانەوەی خۆی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، بۆ سیستمی سەندیکاکان و شتانی لەو جۆرە پاساوی نەهێنایەوە، بومهۆی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە ناو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەدا. هەروەها لەبەر ئەوەی کە پڕوپاگەندەی بۆ خوایەکی تاقانە (واحد) نەکرد، هەموو ئینسانەکانی لای ئەو خوایە بە یەکسان ئەزانی. هەر بەو هۆیەوە، رۆحی یەکسانی خوازی، سەرەکی‌ترین لایەنی ئەو جیهانبینییە تازەیەبوو. لە لایەکی‌ترەوە، ئەو باوەڕە تازەیەش لە ڕووی لۆژیکییەوە، هیچ سازگارییەکی لەگەڵ سیستمی سەندیکاییدا نەبوو، وە ئەم سیستمە لەوە بەدوا بناغە ئایدۆلۆژیکی‌یەکانی خۆی لە دەست دا. "ماف" و "ئاکار"یش گۆڕان بە شتانێکی گشتی و، ئیدی سەربە سیتە یا گرووپێکی تایبەت نەبوون و ئاکیش بە پێچەوانەی سوننەت گەلی دێرین، بە جەستە و رۆحەوە بە سیتەوە گرێ نەدرابوو و ئەرکە ئاکاری و ئایینیەکانی، لەسەرووی گۆشەگیرییە(انزوا) سیاسییەکانەوە بوون. ئیدی دەوڵەت، ئاکارو پاسای دروست نەدەکرد، چوونکە پرەنسیبە سەرەکییەکان، تەنها لە ناو ڕێکخراوە ئایینی و ئیلاهییەکاندا بوونیان هەبوو. ئێدی هێزو سەرکەوتن، بە "ئامانجی سەرەکی" لە قەڵەم نەئەدراو پێویستی بەدیکۆمێنت و بەڵگە هەبوو. وردە وردە توندو تیژی کردنیش هەندێ پاسای لە خۆگرت و شێوەی هەندێ جەنگی مونەدەبانەی بە خۆوەگرت.مرۆڤ دۆستی و بەخشین و هاریکاری کردن و هەروەها چاوپۆشی کردن لە "جنێو" دانیش چووە ریزی ئەرکەکانەوە.لێرەدا مێژوو، ئەنجام گری کۆمەڵناسییانەی مەسیحییەتی، خستە ئەستۆی "سنت ئاگۆستین".

## سنت ئاگۆستین (354-430ز)

ئاسەوارەکەی سێنت ئاگۆستین لە یەکێك لەسەردەمە هەرە دراماتیکەکانی مێژووی مرۆڤدا نووسراوە. لەو کاتەدا، ڕۆم لە لایەن "ئەلاریك[7]"ەوە داگیرکراو، داڕووخان و وێرانبوونی شارێك کە چەندین سەدە بە پایتەختی جیهان لە قەڵەم ئەدرا، کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە دوای خۆی بە جێهێشتبوو.

لە لایەکیتریشەوە، ئەوانەش کە مەسیحییەتیان پەسەند نەکردبوو، بەدەربڕینی نارەزایی، ئەم شڵەژاوێتییەیان زیاتر کرد و بەردەوام ئەو قسەیان دەکرد کە "بەجێ هێشتنی خواکانی پێشوو و پەسەند کردنی مەزهەبی تازە، بۆتە هۆی هەڵوەشانەوەی ڕۆم". لە وەها سەردەمێکدا "سێنت ئاگۆستین" بە داخوازی هاوڕێکانی، نووسینی بەرهەمە مەزنەکەی خۆی واتە "شاری خوا"ی دەست پێکرد، کە لەساڵی 412 تا 426ی زایینی درێژەی کێشا.

شاری خوا، تێکەڵاوێکە لە سەرجەم شارستانێتی دێرین و تیۆروانینێکی گشتی لەسەر مێژووی ڕۆم. تەنها لە ڕووی سۆسیۆلۆژییەوە، زۆربەی ئایدیا و روون کردنەوەکانی ئەم ئاسەوارە، پایەی دادوەری کۆمەڵناسی نوێ پێك ئەهێنێت. هەموو ئەو باوەڕانەی کە دواتر ڕۆڵێکی گرنگیان لە ئەستۆگرت، وەك، مافی خۆرسکی، حەقانییەتی پاشایەتی بنەماڵەیی. ئازادی خۆرسکی مرۆڤ، سەرچاوەی دەسەڵات و "جەبر"ی یاسایی دەوڵەت و....، لەم کتێبەدا کەوتۆتەبەر ڕافە و لێکۆڵینەوە. ئەم ئاسەوارە هەروەها مەسەلەی ئاگادار بوون بە حەقانییەتی "پاسا"شی خستۆتە روو و هەروەها لایەنە گشتییەکانی ئۆمانیزمی[8] ــ کە دواتر بوون بە بناغە سەرەکییەکانی ئەو دیاردەیە ـــ خستۆتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و پاشان باوەڕە ئایدیالیستییەکانی خۆی سەبارەت بە کۆمەڵ، مەزهەب و پلەوپایەی کامڵبوونی ڕۆحی مرۆڤیشی روون کردۆتەوە.

سنت ئاگۆستین، سەبارەت بە جۆری دەوڵەت، باوەڕگەلێکی تایبەتی دەرنەخستووە، تەنها لەو باوەڕەدایە کە هۆی بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی، بەرقەرارکردنی دادپەروەرییە. دەتوانین ئاسەوارەکەی سنت ئاگۆستین بە پردێکی نێوان شێوە بیرکردنەوەی دێرین و شێوە بیرکردنەوەی تازە لە قەڵەم بدەین و بە تایبەت لەو رووەوە کە لەخۆگری تێکەڵاوێکە لە شارستانییەتی دێرین و شارستانییەتی مەسیحی و لە هەمان کاتیشدا، روونکردنەوەی چۆنیەتی گۆڕانی ئەوەی یەکەم (دێرین) بۆ دووهەم (مەسیحی)، گرنگییەکی زۆری هەیە. شاریخوا، لەڕاستیدا، دوایین بەرهەمی گەورەی نووسەرێکی رۆمییە. لە ئاکامدا، دەتوانین بڵێین کە بیرۆکەکانی سنت ئاگۆستین کاریگەرییەکی زۆری لەسەر پێکهاتەی دەوڵەتە مۆدێرنەکاندا هەبووە. زۆرکەس ئەوە دەزانن کە شاریخوا، کتێبی دڵخوازی "شارلەمانی" بوو و لە ژێرکاریگەرێتی تێزەکانی ئەو کتێبەدا، سیاسەتێکی گرتبوە پێش، کە کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لەسەر ئایندەی ئەورووپادا هەبوو.

## پێشینانی کۆمەڵناسی بەراوردی:

لە ناو ئاسەوارەکانی جوغرافی زانان و گەریدەکاندا بە تایبەت لە "هیرۆدۆت" بە دواوە، لەسەدەی 5ی پێش لە زایین، بۆ یەکەم جار هەڵسەنگاندنێك لە نێوان شارستانییەتی یۆنانی و گەلانی رۆژهەڵات و ئەفریقادا بەرچاو دەکەوێت. ئاسەوارە مێژووییەکان و بەسەرهاتی گەلانی سەرکەوتووش هەر لەو سەردەمەدا هاتنە ئاراوەو هەموو زانیارییەکانی ئەمڕۆی ئێمە سەبارەت بە "گل"ی دێرین و ژێرمەن، لە تەفسیرەکانی سزارو ئاسەوارەکانی "تاسیت"ەوە (نزیکەی 35ـ نزیکەی 120ز) پێمان گەیشتووە.

ئەم ئەرێتە، لە چاخەکانی ناوەڕاستدا، سەرەتا لە لایەن جوغرافی زانانی عەرەبەوە وەك "ئدریسی" (نزیکەی 1099 ـ نزیکەی 1164 ز) و "ئیبنی بەتووتە" هەروەها نووسینەکانی گەریدە گەلێکی وەك ماركۆپۆلۆ (1254ـ1323ز) پارێزرا و درێژەی پێدرا. ماركۆپۆلۆ، بۆیەکەم جار ڕۆژهەڵاتی دووری لە کتێبێکدا بەیان کرد، بەڵام لەو سەردەمەدا قسەکانیان بە ئەفسانە دادەدنا، پاشان چیرۆك گەلی ئسپانیولی سەبارەت بە داگیرکردنی دنیای تازەو هەروەها ئەدەبیاتێکی بەرفراوان دەربارەی گەشتیاریو دۆزینەوەکان (اکتشافات) هاتە ئاراوە، کە لەسەدەی هەڤدەی زایینی بەم لاوە پەرەی سەند.

## كۆمەڵناسی فاتالیستی چاخەكانی ناوەڕاست

ئەو شتەی کە دەتوانین بە سۆسیۆلۆژی چاخەکانی ناوڕاست ناودێری کەین، زیاتر لایەنێکی شاراوەی هەیە و بەداخەوە ئێمە ئەمڕۆ کتێب گەلێکی سیستماتیکمان لەو سەردەمەوە بە دەستەوە نییە، کە ڕێکخراوگەلی کۆمەڵگاکانی چاخەکانی ناوەڕاستی خستبێتە بەر لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەوە، بەڵام بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی تێۆلۆژیستە گەورەکانی ئەو سەدانە، دەتوانین پەی بەوە بەرین کە "ڕەش بینی مەزهەبی"، "جیهانی گاتی" و هەندێ مەسەلەی لەو جۆرە، تەواو بەسەر شارستانییەتی ئەو سەردەمەدا زاڵ بووە.

## ئیبنی خەلدوون (1332-1406ز)

بۆ درێژە پێدانی پرۆژکە سۆسیۆلۆژیکەکان کە دوای سنت ئاگۆستین بەتەواوەتی لێك پچڕابوون، ئەبوایە نزیکەی هەزار ساڵ چاوەڕوان بین. ئیبنی خەلدوون، لە ڕووی فکرییەوە بە کەسایەتییەکی بەرجستەی ڕۆژهەڵات لە قەڵەم دەدرێت. لە فەلسەفەدا خوێندکاری (طلبە) ئیبنی ڕوشد ( لە فەیلەسووفە گەورە ماتریالیستەکانی عەرەب) بوو. ئیبنی خەلدوون، ئەو ڕووداوانەی بە چاوی خۆی دیوە کە بوونە هۆی لە ناوچوونی دوایین دەوڵەتگەلی ئیسلامی لە ئیسپانیادا و هەروەها

دروست بوونی ئاژاوه له باکووری ئەفریقا و له ڕۆژهەڵاتیشدا هێرشی تاتارەکانی تەیمووری لەنگ. هەر بەو هۆیەوە، دیاردەکانی پێوەندیدار بە هەڵوەشانەوەی دامودەزگا سیاسییەکانەوە، زیاتر لە هەر شتێکی دیکە، زەینی ئەوی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد.

ئاسەوارە گرنگ و سەرەکییەکەی کە تیایدا خۆی بە پێشەنگی سۆسیۆلۆژی مۆدێرن لە قەڵەم دەدات، پێشەکییەکی تێروتەسەلە کە لەسەر کتێبە مێژووییەکەی خۆی (العبر دیوان المبتدأ و الخبر في ایام العرب و العجم و البربر) نووسیویەتی. ئەو، لە ڕووی سۆسیۆلۆژییەوە بەم جۆرە پێناسەی مێژوو دەکات: "ئامانجی ڕاستەقینەی مێژوو ئەوەیە کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی مرۆڤ، واتە شارستانییەتمان پێ بناسێنێت و هەروەها هەموو دیاردەکانی پێوەندیدار بە شارستانییەتمان فێر بکا وەک: ژیانی بیابانی، هاوسەنگ کردنی (تعدیل) داب و نەریت، ڕۆحییەی خێڵ و خوێن، خۆ فەرزکردنی هەندێ لەگەلان بەسەر ئەوانی تردا، کە ئەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئیمپراتۆرییەکان و زنجیرەی پاشاکان، جیاوازی پلەوپایەی کارو پیشەگەلێك کە خەڵکی پێیانەوە سەرقاڵن وەك: قسەی بە سوود، کارگەلێك کە ژیان دەبین ئەکەن، زانستەکان، هونەرو سەرەنجام هەموو ئەو گۆڕانکارییانە کە ڕەنگە جیبەتی شتومەکەکان، بخەنە ناو ئاکاری کۆمەڵایەتییەوە".

سەرەڕای ئەوە، ئیبنی خەلدوون بە هۆی داماوییەکی ڕەش بینانە کە بەسەر ڕۆحییە و هزریدا زاڵ بووە، بە بیرمەندێکی "قرون وسطائي" ئەدرێتە قەڵەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانکارییەکانی وڵاتە ئیسلامییەکانیش کە لەو سەردەمەدا، پێچەوانەی گۆڕانکارییەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات بوون، بە باشترین شێوە وێنا ئەکات.

لەو سەردەمەدا، لە لایەکەوە ڕێنسانس دەسی پێ دەکردو لە لایەکی ترەوە شارستانییەتە مەزنەکەی عەرەب، بەهۆی هێرش گەلێکی

بەردەوام و دوابەدوای یەکەوە، لە حاڵەتی لەناوچووندا بوو. ئیبنی خەلدوون سەرنجێکی ئەوتۆی بە مەسەلەی بوونی دەسەڵاتێکی یاسایی و هێزێکی هەڵقوڵاوی ڕێکخراوە عەقڵانییەکان لە کۆمەڵگادا نەدەدا. ئیبنی خەلدوون، بەرەت کردنەوەی هەرجۆرە پرۆژەیەکی نۆرماتیڤ، یان پراکتیکی، سەرچاوە و ماوەی خاپاندنی دەسەڵاتدارێتییە سیاسییەکان و هەروەها دروست کردنی دەوڵەت و نابووت کردنیان، دەخاتەبەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەو لەڕاستیدا ئەم مەسەلانە بە دیاردەیەکی "سووڕانەوەیی" (cyclique) لە قەڵەم دەدات کە لەدەرەوەی ئیرادەی ئینسانن و مەبەستی لەوە، دیاریکردنی هۆکارەکانی ئەم تەرتیبە ڕێکوپێکەیە.

کەواتە، ئەو تیۆرییەی کە دەرەنجامی باوەڕەکانیەتی، لە چەند ڕووەوە لەگەڵ ئەو سووڕانەی (cycle) کە ئەفلاتوون باسی لێوە کردووە، وێکچوونێکی زۆری هەیە. هەروەها بەبڕوای ئیبنی خەلدوون هۆی زنجیرەی پاشاکان و چینی دەسەڵاتداری بورژوا، دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی پسیکۆلۆژی وەچەکان. بە وتەی ئیبنی خەلدوون، ژیانی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی سروشتییە و بارودۆخی کۆمەڵایەتی، زیاتر لە ژینگەو ئاو و هەواوە سەرچاوە دەگرێت و ئەم بارودۆخە، لە دیاردە سیاسییەکان کەبە لق (فرع) و پاشکۆ دەژمێردرێن، سەقامگرتووتر و پایەدارترە.

ئینسان تەنها بوونەوەرێکی زیندووە کە پێویستی بەدەسەڵاتدارێتی (حاکمیت) هەیەو، بەبێ حاکمییەت، کۆمەڵگا تووشی بێ نەزمی و ئاژاوە و ئانارشیزم دەبێت چوونکە هەمیشە غەریزە خراپەکان زیاتر بەسەر مرۆڤدا زاڵن. بەڵام خودی حاکمییەت، بەسەر دەسەڵاتدا زاڵە و دەکەوێتە دەست کەسانێك کە بە نازایەتی و فکر و تێگەیشتن و بەهرەی زاتی خۆیانەوە بەدەستی ئەهێنن. ئەم سیفەتانە کە لەڕاستیدا، توانای بەدەست هێنانی دەسەڵات ئەهێنێتە ئاراوە، بە هۆی ژیانی خێڵەکییەوە سەرهەڵ ئەدەن. سەرکەوتنە خێراو مەزنەکانی هەندێ

هـۆزی گـەورە و بچـووکی وەك؛ "ژێرمەنـەکان"، "هونـەکان"، "عەرەبـەکان"، "مەغولـەکان"، "تاتارەکـان"، "نۆرمانـەکان" نموونەیەکی ئەو مەسەلەیەن (ماوەیەك دوای ئیبنی خەلدوون، ئەم پرەنسیبە ئیدی بایەخی خۆی لە دەست دابوو و تەنانەت پاش هاتنەگەڕی چەکە کوشندەکان، مەسەلەکە بە تەواوەتی گۆڕا). بەڵام لە ڕووی سیکۆلۆژییەوە زاڵ بوونی هەر زنجیرەیەك، چ جەماوەر بێت، یان خود گرووپێك، بەگشتی سێ وەچەو بەواتایەکی دیکە، سێ سەدە نەخایەنێت. چوونکە بە گەڕخستنی دەسەڵات، ئەو پیاوە ئازاو تێکۆشەرانەی کە پێشتر دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە دەخاتە لاوەو دەسەڵات دەسپێردرێتە دەست وەچەیەکی تەمەڵ و گەندەڵ و بێلیاقەت. ئەم وەچانە لەئاکامدا وا تەسەور دەکەن کە بە هۆی کۆشش و تایبەتمەندی تەقالاکانیانەوە نییە کە دەسەڵاتیان پێگەیشتوە، بەڵکوو تەنها بە هۆی جۆری زاوزێ یان ڕەگەزەکەیانەوەیە کە دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتووە. تەنها لەبارودۆخێکی لەو جۆرە دایە کە دەتوانین ئەوانیش لەسەرکورسی دەسەڵات لابەرین..

ئیبنی خەلدوون، مەسەلە ئابوورییەکانیشی بە هۆکارێکی گرنگی ئەم گۆڕانکارییانە لە قەڵەم داوەو، لەم بارە پشت بە نموونە مێژووییەکانەوە نەبەستێت و وەك نموونە باسیان لێدەکات. بە وتەی ئیبنی خەلدوون "ژمارەی جەماوەریش لە دوایین ڕۆژەکانی هەر ئیمپراتۆرییەکدا بە شێوەیەکی نائاسایی ڕوو لە زیاد بوون دەکات" و هەر بەو هۆیەوە، کێشمەکێشی زۆری ئابووریش دەخەنەوە.

ئیبنی خەلدوون بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەرو ئازایانە کەڵکی لە میتۆدەکانی خۆی وەرگرتووە و ڕووداوە سەرسام کەرەکان و هەروەها گۆڕانکارییەکانی مێژووی ئیسلامی، بە پێی بیروڕا کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئابوورییەکانی خۆی، لێك داوەتەوە.

سەرەنجام ئاسەوارەکانی ئیبنی خەلدوون، سۆسیۆلۆژییەکی سەرنج ڕاکێشی "تەوسیفی" یان تێدایە کە لەخۆگری سۆسیۆلۆژییەکی ڕاستەقینەیە سەبارەت بە ئەفریقای باکوور، زۆربەی لایەنەکانیشی، هەنووکەش لەگەڵ سیستمی کۆمەڵایەتی ئەم سەرزەمینەدا دێتەوە.

بەشی دووەم:

# سەردەمی نوێ

## ڕێنسانس

بەرچاوترین دیاردەی ڕێنسانس ئەوەیە کە، ڕۆشنبیران، فەیلەسووفان، نووسەران، هونەرمەندان و هزرمەندانی ئەو سەردەمە، بە شێوەی ڕاستەوخۆ، پێوەندییان کرد بە بیرمەندانی کۆنی یۆنان و ڕۆمەوە. لێرەدا هەندێ ڕووداو هاتنە ئاراوە کە لە سەردەمی دێرین بەم لاوە نموونەیان نەبووەو ئاکامگەلێکی زۆریان لێکەوتەوە. شایانی باسە کە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا، چینی باڵاو خەڵکی ئاسایی لە بنەڕەتدا جۆری بیرکردنەوەیان وەکوو یەك وابوو. بەڵام پاش ڕێنسانس، مەسەلە فکرییەکان لە بازنەی خەڵکی ئاسایی چوونە دەرەوەو زۆری نەخایاند کە ئەم دابڕانە لە بوارەکانی زانست، ستاتیك و ئەدەبیاتدا دەستی پێکرد. بەڵام ئەم مەسەلەیە لە بواری فەلسەفەدا ماوەیەکی زیاتری خایاند، چوونکە لەم بوارەدا، سەرەڕۆیی و دەمارگرژی ئینسانە مەزهەبییەکان ڕێگربوون لە بەردەم دابڕان لە سوننەتەکانی چاخەکانی ناوەڕاست. شیاوی باسە هەربەو شێوەی کە "ڕۆلاندی تووڕە[9]" و "دۆن کیشۆت[10]" کۆتایی هاتنی ئەدەبیاتی چاخەکانی ناوەڕاست و سەرجەم بابەت و پاڵەوانە تایبەتەکانیان ڕاگەیاند، بواری سازدان و بە تایبەت بڵاوکردنەوەی فەلسەفەیەکی تازە هاتە ئاراوە، کە هۆی ئەوەش ڕەخنەگرتنە گاڵتەجاڕییەکانی هەندێ گومانکاری وەك "ئارتین[11]"، "بووکاچیۆ[12]"، و تا ڕادەیەك "مەکیاولی" لە ئیتاڵیاو "ڕابلە" و "مۆنتی" لە فەرەنسەدا بوو.

لە لایەکی دیکەوە، لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بواری ئابووری بە زووترین کات گۆڕانی بەسەرداهات. شارە گەورەکان دروست بوون و نەوشارانە، شوێنێکی باش و گونجاو بوون بۆ بیرکردنەوە لەسەر بابەتە کۆمەڵایەتییەکان. لە تەنیشت ئەو شارانەو هەروەها شان بەشانی فیۆدالیزم، کۆمەڵگا گەلێکی جۆراوجۆری مۆدێرن هاتنە ناراوە و گەشەیان سەند. کۆمارەکانی ئیتالیا (وەك باروذۆخی پێشووی ئەسینایییەکان بەرانبەر "ئۆپاتریدەکان"[13]) بەرێژەیەکی زۆر، لەدژی فیۆدالیزم، ساختاری سیتەگەلی بازرگانیو "رۆشنبیری" سەردەمانی دێرینیان پێك ئەهێنا. هەندێ داهێنانی (اختراع) تەکنیکی و ئابووری، گواستنەوەی کاڵاو شتومەك و هەروەها هاتوچۆکردنی تاکەکانی ئاسانتر کرد. بە هۆی پارەی کاغەزەوە (بە هەموو جۆرەکانیەوە) ئەوتوانایە هاتە ناراوە کە بە بێ‌مەترسی قەڵاچۆکردنی مل هۆڕان و ستەمگەرێتی دەسەڵاتدارە فێودالەکان، پارە بگوێزرێتەوە بۆ هەموو شوێنێك. سەرەتا لە ئیتالیا و پاشان لە هۆڵەندا، دامەزرانی تەکنیکێکی بەهێزی بانکداری و دوایش سەرهەڵدانی داوودەزگا گرنگە پیشەسازییەکان، جۆرە پێوەندی گەلێکی ئاڵۆز و هەندێ کێشەی کۆمەڵایەتی هێنایە ناراوە کە، نێدی لە چوارچێوەی ساکاری کۆمەڵگای چاخەکانی ناوەڕاستدا جێی نەئەبووەوە.

ئەو دژایەتییانەی (تضاد) کە بەهۆی ریفۆرمەوە[14] سەریان هەڵدا، هزرمەندانی ناچار کرد کە بە مەبەستی دۆزینەوەی هۆکارەکانی پێوەندیدار بەو مەسەلەیەوە، هەموو سوننەتە مەزهەبی و فەلسەفییەکان بە قووڵی بخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە. ئەو کێشمەکێشانەی کە لەسەر بەشە جۆراوجۆرەکانی مەزهەب، لە نێوان خەڵك و دەسەڵاتداران، یا خود ئەریستۆکراتەکان و دەسەڵاتداراندا سەری هەڵدابوو، لێکۆڵینەوەو راڤەکردنی بابەتە سیاسییەکانی هێنایە گۆڕێ و، هەندێ پرسیاریش سەبارەت بە مەسەلەکانی پێوەندیدار بە چییەتی دەسەڵاتی سیاسی،

پاشـایەتی بنەماڵـەیی و چوارچـێوەکانی، هـەروەها زنجـیرەی پلـەو پایـە کۆمەڵایەتییەکان و گۆڕانکارییەکانی خرایەڕوو.

بـەڵام ڕێنسانس، تـەنها پشـتی بـەباوەڕەکانی یۆنانییەکانـەوە نەبەسـت. سۆسیۆلۆژی یۆنانییەکان، حاڵەتێکی مەنگ و ڕاوەستاوی هەبوو، لـە هـەمان کاتیشـدا تـێزی بـوو لـە ڕەشبـینی و تـەنها هیوایـەتی، بەدەسـت هێنـانی "سەردەمێکی زێڕینی" یۆتۆپیایی بـوو. مەسـیحییە سـەرەتاییەکان یـەکجار گەشبین بوون، چوونکە پێیان وابـوو کـە مـرۆڤ لـە ڕووی ئاکارییـەوە قـابیلی گۆڕانـە بـەڵام لـە لایـەکی تـرەوە باوەڕمەنـدی بـە "یەکـەمین دارمـان[15]" و ترسی دایم لەتاوان و ڕیسوابوون، کە چـینە دەسـەڵاتدارەکانیش بۆ قـازانجی نامانجـەکانی خۆیـان پـەرەیان پـێ دەدا، کۆمەڵـگای چـاخەکانی ناوەڕاسـتی تووشی خەم و خەفەت و نیگەرانی کردبوو.

بەڵام، لە ڕێنسانس بەم لاوە، بابەتەگرنگ و سەرنج ڕاکێشەکانی مەسـەلە کۆمەڵایـەتییەکان، بـە گەشـبینییەکی بـێ وێنـە لـە چـاخەکانی ناوەڕاسـتدا و تەنانەت لە سەردەمی دێرینیشدا، شان بە شانی یەکدی ئەخرانە بەر ڕاڤـە و لێکۆڵینـەوە. ئـەم گەشـبینییە، زیـاتر لـە "باوەڕمەنـدی بـە پێشکەوتن" دا، خۆی دەنوانـد و بـەتایبـەت لەسـەدەکانی حەڤـدە بـەدواوە، خـەڵك، خـۆی لـە پێشینان بەزیاتر و عاقڵتر دەزانی. "دێکارت" و هـەروەها "ویکۆ"، "لاك"، "مۆنتەسکیو"، "والتـەر" و "کۆندرسـە"، بـە باشـترین شـێوە ئـەم بـاوەڕ بەخۆبوونـەیان بـەیان کـردووە. تەنانـەت ئـەو کەسانەش کـە سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی کـە لـە پێشینانیان لەسـەرترن، تـەنیا لایـەنی ئاکـاری ئـەو مەسەلەیان لەبەر چاو بوو. "ڕۆسۆ" و شاگردەکانی بـەو جـۆرە بـوون بـەڵام لە هەمان کاتیشدا کە پشتگیرییان لـە "گەڕانـەوە بـۆ میهرەبـانی و دڵۆڤـانی جاران" دەکرد، دژایەتی کردنی دۆگمای (Dogme) دارمـانی سەرەتاییشـان بە شتێکی پێویست لە قەڵەم دەدا.

سـەرهەڵدانی ئـەو خواسـتانەی کـە دواتـر بوونـە هـۆی پێـك هـاتنی سۆسیۆلۆژییەکی "عەمەلی"، تـا سـەدەی هەژدەهـەم درێـژەی کێشا. بـەڵام لـە

سەدەی شانزدەهەمەوە، لەم بوارەدا دوو ڕەوتی سەرەکی لە ئارادا بوون، یەکەمیان ڕەوتێکی عەقڵی(cmpirist) بوو کە کەسانی وەك "**مەکیاولی**" و ئیکۆنۆمیستە سەرەتاییەکانی وەك "**بودن**"، "**مونچرشتین**" و "**بوترۆ**"، پشتیوانییان لێدەکرد و ئەوی دیکەیان ڕەوتێکی خەیاڵی (utopic) بوو. ئەم ڕەوتەی دوایی، بە پێی سوننەتی **ئەفلاتوونی**، سیتە ئایدیالەکانی بە هەموو خەیاڵ و وەهمەکانیەوە ڕووبەڕووی واقعییەت دەکردەوە لەوانە "**یۆتۆپیا**" لە نووسینی **تووماس مووروس** و هەروەها "**شاری هەتاو**" نووسینی "**کامپانلا**").

## مەکیاولی (1469-1527ز) و، هۆبس (1588-1679ز)

ئەو توندوتیژییانەی کەبەسەر ژیانی سیاسی چاخەکانی ناوەڕاستدا زاڵ بوو، بەهۆی چوار هۆکارەوە کەمترو کەمڕەنگتر دەکرا:

1. هەڵس و کەوتی شوالییەگەری، کە هەڵقوڵاوی باوەڕە مەزهەبییەکان (لە جیهانی مەسیحییەت و هەروەها لە جیهانی ئیسلامیشدا) و ڕێکخراوەسەربازییەکانی سیستمی ئەریستۆکراتیك بوون؛
2. تەکنیکی سەربازی ئەو سەردەمە، بە تایبەت کەپێکهاتەیەکی "**قەڵا**" ئاسای هەبوو، شێوەیەکی بەکەڵکتر بوو بۆ بەرگری کردن [16].
3. سەقامگیرکردنی ئەوبارودۆخ و ئاسایشەی کە دەرەنجامی ماف سیاسی فیۆداڵی و مانای تایبەتی پاشایەتی بنەماڵەیی بوو.
4. باوەڕە مەزهەبییەکان.

بەڵام سست بوونی باوەڕە مەزهەبییەکان و شۆڕشگەلی دوایین ساڵەکانی چاخەکانی ناوەڕاست؛ واتە لە ڕۆژهەڵاتدا داگیرکارییەکانی **مەغولەکان**، **تاتارەکان و تورکەکان**، هەروەها ڕووخانی **بیزانس** و لەخۆرئاواش دا هەڵوەشانەوەی وردە وردەی سیستمی **فیۆداڵی** و وێرانبوونی زۆربەی **سیتە کۆمارییەکانی** ئەوسەردەمە، بوە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ ڕاڤە و لێکۆڵینەوەی تازە. ڕاڤەکردنی مێژووی ئەرین کە هێندی هێندی بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەدۆزرایەوە، یارمەتی ئەو لێکۆڵینەوانەی دەدا.

تیۆروانینەکانی "هۆبس" و "مەکیاولی" ئەوە دەردەخەن کە باوەڕ بە هەندێ پرەنسیپی ناکاری و فەزایی ــ کە بناغەی سیستمێکی دیاریکراوی سیاسی پێك نەهێنن ــ لە زەمینی تاکەکاندا "راوەستانێك" نەهێنیتە ئاراوە و پاشان بە هۆی نەبوونی پرنسیپێکی پەسەندکراوی دیکەوە، سەرنجێکی زۆر بە توندو تیژی کردن دەدرێت. بە بیروڕای مەکیاولی و هۆبس، ژیانی کومەلگاکان، بە پێی شێوەی کەلك وەرگرتن لە دەسەلات بنیات نراوە. سیکۆلۆژی کۆمەلایەتی ئەوان لەم ڕستە بەناوبانگە "Homo Hommi lupus17".و هەروەها لەم قسەیەی مەکیاولیدا کۆ دەبێتەوە کە "خەلك زیاتر حەزیان لە خراپەکردنە وەك لە چاکە کردن".

بەلام مەکیاولی، تەنها پشتی بەم پرەنسیپە نەبەستووە، بەلکوو هەوڵ دەدات لە ئەزموونە مێژووییەکان، زانستێکی ــ یان باشتر بلێین هونەرێکی ــ سیاسی بهێنێتە ئاراوە کە لێکۆلینەوەیەکی وردبکات لەسەر ئەو دەولەت ودەسەلاتە دژبەیەکانەی کە هەلۆیستیان لە دژیەکدی وەرگرتووەو لە ناوەوەی دەولەتێکدا لە یەکتری دەدەن.

ئاسەوارە گرنگەکەی ئەو، واتە "لێکۆلینەوە لەسەر دە کتێبە سەرەتاییەکانی تیت لیت" مێژووی ڕۆم بە پێی ئەوجۆرە میتۆدانە بەیان دەکات. مەکیاولی لەم ئاسەواردا، ڕێکخراوی سیاسی کۆماری ڕۆم ــ لەو ڕووەوە کە ڕێکخراوی ناوبراو تایبەتمەندییەکانی هەر سێ ڕژێمی پاشایەتی، ئەریستۆکراتی و دیمۆکراسی لە خۆیدا کۆکردبووە ــ بە شتێکی یەکجار "بالا" لە قەلەم ئەدات. کۆنسوولەکانی ڕۆم، بە چاو پۆشی کردن لەو شتانەی کە پاشایەتی بۆماوەیی لێیانی قەدەغە کردبوو و، هێندەی پاشادەسەلاتیان هەبوو و "سەنا"ش، پارێزگاری دەکرد لە بەرژەوەندی ئەریستۆکراتەکان و هەروەها ئەنجومەنەکانی خەلکی ڕەمەکیش، لەبەرانبەر زێدەڕەوییەکانی چینی دەسەلاتدارداپارێزگارییان لەخەلکی عەوام دەکرد.

گرنگایەتی ئەم مێژوونووسە فلۆرانسیە لەوەدایە کە بوونێکی سەربەخۆی بە فەلسەفەی مێژوو و سۆسیۆلۆژی بەخشی. لەسەردەمی مەکیاولی بەدواوە، کەسانێك کە لەم بوارەدا لێکۆڵینەوەیان کردووە، سەبارەت بە هێزەکان و هاوسەنگییە کۆمەڵایەتییەکان، ئیلهامیان لە باوەڕەکانی ئەو وەرگرتووە.

ئۆمانیستەکانی ڕێنسانس و پاشان "مۆنتی"ش، پاشماوەی دۆگماتیزمی چاخەکانی ناوەڕاستیان بە توندی خستە بەر ڕەخنەوە. بەڵام دروست کردنی چوارچێوەیەك بە مەبەستی پێکهاتەیەکی لەباری فکری، بۆ ئەوەی کە جێگای ئەو دۆگماتیزمە بگرێتەوە، لە ئەستۆی دێکارت دابوو.

## دێکارت (1596-1560ز)

میتۆدی "کارتزین[18]" شۆڕشێکی ڕاستەقینەی لە فەلسەفەدا هێنایە ئاراوە. میتۆدی کارتزین بە ڕاسیۆنالیزمەکەیەوە، کاریگەری لەسەر بیرۆکەکان دانا و دواتر کەوتەڕێزی ئەو زانستە کۆمەڵایەتی و تێزە سیاسییانەی کە تەنانەت خۆیشی حەزی نەدەکرد قسە و باسیان لەسەربکات. لە هەندێ ڕستەدا، کە بە پارێزەوە دەیانڵێ، هۆی دەرنەبڕینی بیروڕاکانی خۆی لەو بوارەدا بەیان ئەکات و دەڵێ: "…. لەبەر ئەوەیە کە من هەرگیز ناتوانم دان بەم ڕۆحییە پڕ لەدڵەراوکێ و نیگەرانانەدا بنێم، چوونکە لە ڕووی چۆنیەتی لە دایك بوونیانەوەو هەروەها لە ڕووی سامانەوە بە هیچ شێوەیەك بەکەڵکی بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی نایەن و لەهەمان کاتیشدا، هەموو کات بەخەیاڵی خۆیان، ڕیفۆرم گەلێکی تازە لەم بوارەدا ئەنجام ئەدەن. وە ئەگەر بمزانیایە هەر ئەم نووسینە شتێکی وای تیایە کە ناچارم بکات گومان لە جۆرە "شێتی"یەکی وابکەم، بەڕاستی لە بڵاوکردنەوەیدا تووشی ڕەنج و ئازار دەبووم. هەوڵدانی من، هەرگیز لە ڕیفۆرمی بیرۆکەکانی خۆم و دامەزراندنیان لەسەر ئەو بنەمایانەی کە تایبەت بە خۆمن، هەرگیز تێی نەپەڕاندووە". لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ بیروڕا لە بەرهەمەکانی دێکارتدا، لە ڕووی سۆسیۆلۆژییەوە هەندێ لایەنی

تایبەتی و تەنانەت بە کەڵکیش پێك دەهێنن. بۆ نموونە، بەر لە هەموو شتێك ئەم باوەڕە کە هەموو پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی بە ناچار پێڕەوی لە پێشکەوتنی زانستی پزشکی دەکات.... چوونکە تەنانەت ڕۆحییەو ئاکاریش، هێندە پێوەندییان بە چۆنیەتی میزاج و هەروەها چۆنیەتی ئەندامانی لەشەوە هەیە کە، ئەگەر دۆزینەوەی ئامرازێك بۆ عاقڵ کردن و کارامەکردنی خەڵکی، زیاتر لەڕادەی ئاسایی، لە توانادا بێت، بە بیروڕای من دەبێ لەناو زانستی پزیشکیدا بەدوای توانایەکی لەو جۆرەدا بگەڕێین. ماوەیەك دواتر "کۆتلە[19]" کە پێدەچێت تەنانەت هەرگیز "دێکارت"ی بە بیردا نەهاتبێت، بەدەس نیشان کردنی ئەوە کە گەشەسەندن و کامڵ بوونی زانست و هونەر و پیشەسازی، ئەوە دەخوازێت کە تەمەنی نیسبی وەچەکان، بەڕادەی پێویست درێژبێت، ئەو تیۆریەی سەرەوە روون دەکاتەوە.

لە ئ گامدا، بەبڕوای دێکارت هەموو ئاکارێك ئەبێ بە شتێکی "کاتی" لەقەڵەم بدرێت. چوونکە بە دڵنیاییەوە، سەرهەڵدانی ئاکارێکی هەتایی و حەتمی، پەیوەستە بە کامڵ بوونی یەکجاری زانستەوە. ئاکارێکی تەواو زانستی، دەبێ لەسەرووی هەموو زانستەکانەوە دابنرێت. مەبەستی من والاترین و کامڵترین ئاکارێکە کە بەڵگەیەك بێت بۆ بە ئاگابوونی تەواو سەبارەت بە زانست و هەروەها دواهەمین پلەی شارەزایی و لێهاتوویی.

## ئسپینۆزا (1632-1677ز)

ئسپینۆزا لە ناسەوارەکانی خۆیدا و بەتایبەت لە کتێبێکدا بە ناوی "ئامیلکەی تیۆلۆژیکۆ ـــ پۆلیتیك[20]" دا، هەندێ لە مەسەلەکانی فەلسەفەی کۆمەڵایەتی دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. بە بڕوای ئەو، خەڵکی لە ڕاستیدا لە ژێر کاریگەریی نەفس و ویستەکانی دڵیان دان و مافەکانیان و دەسەڵاتەکانیان کە هەر هێندەی یەکیشن، هەمیشە لە شەڕ و ململانێ دان.

ئسپینۆزا مەسەلەی کلاسیکی فەلسەفەی چاخەکانی ناوەڕاست واتە، individuation بە شێوەیەکی تازەتر دەخاتەڕوو: چۆن دەکرێت

کەسێک لە کاتێکدا کە بەشدارە لە کۆمەڵگایەکدا، واقعییەتی بوونی خۆی بپارێزێت؟

ئەو، هاوکاری کردن بە شتێکی پێویست بۆ ئەو مەسەلەیە لە قەڵەم ئەدات. مرۆڤ ئەوە دەزانێت کە تەنها بە هۆی چالاکیەکانییەوە ناتوانێت دەسەڵات و ئازادی رۆحیی تەواو بە دەست بهێنێت. ئاگایی راستەقینەی زانستی و ژیانی مادی تەنها لە رێگەی یەکگرتنی هەموو هێزەکانی جەستەو رۆحەوە، دابین دەکرێت. لە لایەکەوە، تاک هەرچی ئازادی و بەهرەی "دەسکرد"ی زیاتر بەدەست بهێنێت، ئەوەندەش ناکۆکییەکانی نێوان خەڵکی کەم دەبێتەوەو مرۆڤیش زیاتر هەوڵ ئەدات بەدوای ئەو شتانەدا بگەرێت کەبە قازانجی خەڵکی بەگشتین.

ئسپینۆزا، لەگەڵ ئاکارگەلی لە جۆری چاخەکانی ناوەڕاست، کە تاکەکان هان ئەدەن لەسەختی و سەخڵەتی دابڕین و تڕین لە بەدبەختی و چارەڕەشی، ناکۆکە و لەو باوەڕەدایە کە :"چێژوەرگرتن و خۆش گوزەرانی، خۆی لە خۆیدا باشە و خەم و پەژارەش خۆی لە خۆیدا خراپە. هەر بەو هۆیەوە رق، ترس، بێ متمانەیی، پەشیمانی، تۆبەکردن و شەرمەزاریش خراپن. یەکبردن بە راستییەکان، تێڕامانە لە سەرژیان، نەک لەسەر مەرگ."

ئسپینۆزا، لە ژێرکاریگەرێتی بیرۆکەکانی "هۆبس"دا بوو. بەڵام لەگەڵ ترسی ئەولە "کۆمەڵانی خەڵک"، کۆک نەبوو. چوونکە بە بیروڕای ئەو، تەبیعەتی هەموو خەڵکی وەکوو یەک وایە. هەر بەم هۆیەوە، "ئەو بڕیارانەی کە بە پارێزەوە و بە مەبەستی دابین کردنی ئاسایش و ئارامی دەدرێن، ئەوەندەی بۆ تاکەکانی وڵاتێک پێویستن، هێندەش بۆ چینی دەسەڵاتدار پێویستن". بەوتەی ئسپینۆزا، کۆمەڵگا لەیەکگرتنی تاکەکان پێک هاتووە. ئەم تاکانە هەڵوێستە سروشتیەکان، واتە لەراستیدا، خواستە سەرەتاییەکانی خۆیان هەروەک لەوەوپێش ئەپارێزن. کەواتە، کۆمەڵگا جەستەیەکە کە ملکەچی یاسا بنەڕەتییەکانی ئەندامانی خۆیەتی.

سەرجەمی ئەو یاساگەلە، کە بە هیچ شێوەیەك كۆمەڵگا نەیگۆڕیون و لە سەر ئەوانەش دامەزراوە، بە مافی "سروشتی"، ناودێر دەکرێن. لە لایەکی ترەوە، کۆمەڵگا بریتییە لە سیستمی هێزەکان و دەسەڵات و واقعییەتەکەشی تەنها پەیوەستەبەو دەسەڵات و واقعییەتەی کە تاکەکان پێی ئەبەخشن. "کۆمەڵگایەك کە هێمنایەتییەکەی لەسەر کز و لاوازبوونی ئەندامەکانی ڕاوەستابێت، کۆمەڵگایەك کە ئەندامەکانی وەك "مەڕ" بەم لاولادا هەڵئەسووڕدرێن و وەك کۆیلە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێت، ئیتر کۆمەڵگا نییە، بەڵکوو تاریکستانێکی پڕ لە بێدەنگییە".

کەواتە، بە بیروڕای ئسپینۆزا سەربەخۆیی تاکەکەسی و یەکگرتنی ئۆرگانیکی دەوڵەت، پێوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ یەکدی داهەیە. تاکی کۆمەڵایەتی، دەتوانێت بەهۆی تەبایی هزری و فکرییەوە، لەگەڵ تاکە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە، هاوکاری بکات بە مەبەستی دروست کردنی تاکێکی تازە و کامڵتر و، بەم جۆرە ئەم مەسەلەیە ڕەنگە تاهەتایە درێژەی هەبێت.

هەر لەو سەردەمەدا، هەندێ تێز (دوکتەرین) و تیۆری دادوەری (قضـائي) هاتنە ئاراوە کە مافی "سروشتی" و مافی نێو دەوڵەتییان خستەبەر لێکۆڵینەوە، هەموو توانایان تەرخان کردبوو بۆ دامەزراندنی تێزێکی ڕاستەقینەی فەلسەفی و هەروەها پیاچوونەوەی حوکمە قەزایی و سیاسییەکانی سەردەمی خۆیان.

## تێزەگەش بینانەکان ( optimiste )

"لاك[21]" (1632-1704ز) و "یانسك[22]" بە هۆی تیۆری هاوکاری فکرییەکەیانەوە، بارودۆخی پسکۆلۆژیکی کامڵ بوونی مرۆڤیان پیشان دا و بەم جۆرە، بە هۆی سەرجەم تێزەکانیانەوە بواری ئەو شتەیان ڕەخساند کەدواتر بە "فەلسەفەی ڕووناکی" ناوبانگی دەرکرد.

نووسەری دیکەی بەریتانی، "ماندویل[23]" لە کتێبێکدا بە ناوی "ئەفسانەی هەنگەمێشە" کەدەنگ و هەرایەکی زۆری لێ کەوتەوە، هەوڵی دا ئەوە بسەلمێنێت کە هەمان ئەو کەم و کوڕیانەی کە ناکارخوازەکان

سووکایەتییان پێ دەکردن، وەك: فرەخۆری، لە خۆبایی بوون، خۆشرابوێری و... لە راستیدا بوونەتە هۆی کامڵبوونی شارستانییەت و هونەرو تەکنیك و، ئەم خواستانە کە زۆربەی کات شیاوی لۆمەکردنن، لەڕاستیدا بایەخدارترین بزوێنەری بزوتنەوەن. وەئەگەر لە ناراداندەبن، مرۆڤ لە حاڵەتێکی وەك ناژەڵەکاندا ژیان بەسەر دەبات. بە بیروڕای ماندویل ژیان لە رەنج و سەختیدا بەسەربردن؛[ واتە ریازەت کێشان]، تەنها ڕێگە چارەی ئەو ئینسانە تەمەڵانەیە، کە دژی شارستانییەت و ئینسان دۆستی دەجووڵێنەوە.

بە بیروڕای فیزیۆکراتەکان[24] ئەوە هەندێ یاسای سروشتین کەژیان، یان بەلانی کەمەوە ژیانی مادی کۆمەڵگاکان رێك ئەخەن. بەبڕوای فوتابخانەی فیزیۆکراتیك کە "کۆاسنی"[25]"پزیشکی خاتوو "دوپمپادور"[26]" دایمەزراندبوو، ئەم یاسا سروشتی و پێویستانە، وەك کردەوەگەلی فیزیۆلۆژیکی ئۆرگانیزمی مرۆڤ شتانێکی پایەدار و سەقامگرتوون. "تەنها ناسینی ئەم یاساگەلە والایە کە دەتوانێت هێمنایەتی و سەرکەوتنی هەتایی ئیمپراتووریەك مسۆگەر بکات. جیا لەوەش، ئەم یاساگەلە بە شێوەیەکی سروشتی بەدی دێن و، گوشار خستنە سەریان دەبێتە هۆی وەرگێڕانیان". لە سەردەمی نەزم و رێکوپێکی و روو لە زیاد بوونی ئاڵوگۆڕە بازرگانییەکاندا، رێکخراوگەلی رێکوپێکی سەندیکایی و هەروەها نرخ دانان لەسەر هەموو کاڵا و خزمەتگوزارییەکان و بە کورتی، لەسەردەمێکدا کە نابووری بە هەموو لایەنەکانییەوە، بەدروستی رێك ئەخراو بەرێوە ئەبردرا، فیزیۆکراتەکان لە دژی هەموو جۆرە نەزم و رێکوپێکی یەك راوەستان و رایان گەیاند کەدەبێ بەهۆی ئازادی نابوورییەوە، "فراوانی" دابین بکەین.

رەنگە بتوانین بڵێین کە فیزیۆکراتەکان راستەقینەترین نوێنەرانی شێوە بیرکردنەوەی سەدەی هەژدەهەمن. بەبیروڕای ئەوان، نەزمی سروشتی لە خواستی خواوە سەرچاوە دەگرێت و تەنها بە هۆی ناساندن و جێگیر کردنی نەزمی سروشتەوە دەتوانین خەڵك وشیار بکەینەوەو هەروەها لەوەش دڵنیا

بکرێن کە سۆز و بەزەیی و ڕەحمەتی سروشت بەنیسبەت ئەوانەوە ڕۆژبەڕۆژ رووله زیاد کردنە.

هەروەها بەبڕوای فیزیۆکراتەکان، گەشەسەندنی ئابووری و شارستانییەت، مەسەلەیەکی سروشتی و تەقدیرییەو بە شێوەیەکی خۆڕسکی روو ئەدات، هەڵبەتە بە مەرجێك کە بەری پێ نەگیرێت.

## ئادام ئسمیت (1723-1790ز)

لە سەدەی هەژدەهەمدا فەلسەفە و ئابووری بە تەواوەتی پێوەندییان بەیەکەوە هەبوو. ئابووریزانە لیبرالەکانیش وەك فیزیۆکراتەکان بیریان دەکردەوە. بەلام هەندێ بیروڕای فەلسەفییان خستەپاڵ تیۆری فیزیۆکراتەکان و بەم جۆرە سەرجەمی بەرهەمەکانیان لە ڕاستیدا سیستمێکی کۆمەلایەتییە کە بەربلاوتر و هەروەها تواناکانیشی زیاترە. ئادام ئسمیت کەدامەزرێنەری ڕاستەقینەی قوتابخانەی لیبراڵە، بە هەموو لایەنەکانیەوە، سەرەتا وەك ڕەوانناس و مۆرالیست دەستی بە کارکرد. ئەو یەکێك لە خوێندکارەسەرەکییەکانی "جێرمی بێنتام[26]" بوو و لایەنگری لە بەکەڵك بوونی "مۆراڵ" دەکرد. ئسمیت، سۆسیۆلۆژی تەقدیریشی خستە سەر ئابووری تەقدیری فیزیۆکراتەکان و لەو باوەڕەدا بوو کە سروشت کارێکی وا دەکات کە سەرەڕۆییەکانی مرۆڤ بە قازانجی کۆمەلگا بکەوێتەوە. دەتوانین بڵێین کە تیۆری سۆسیۆلۆژی ئادام ئسمیت، لەگەڵ "ئەتۆمیزم[27]"ی سیکۆلۆژیکی سەدەی هەژدەهەمدا تەبایە.

بە بیرو ڕای "**کۆندرسە**" (1743-1794ز) پێشکەوتن بریتییە لە: کەڵەکەبوونی ئاگاییە زانستییەکان و هەروەها بە کار هێنانیان، کەدەبێتە هۆی باشتر بوونی بارودۆخی مرۆڤ. ئەو گەنجینە دۆزراوانەی کە سروشت پێشکەشی زانستی کردوون، هەرگیز تەواو نابێت و هەر بۆیە کامڵبوونی ئینسانیش هیچ سنوور و چوارچێوەیەکی تایبەتی نییە.

کۆندرسە، پشت بە وەسفکردنی باشتر بوونێکی نادیارەوە نابەستێت، بەڵکوو لەکتێبەکەیدا بەناوی "**خشتەیەك لە پێشکەوتنەکانی رۆحییەی مرۆڤ**" کە بە شێوەیەکی تراژێدیانە نووسراوە( کۆندرسە زیندانی کرابوو و چاوەڕێی بەڕێوە بردنی حوکمی لە سێدارەدان و تێخی گیوتین بوو) ئەو قۆناغانەی کە تائەمڕۆ مرۆڤ تێی پەڕاندوون، لێکداوەتەوە و هێڵەسەرەکییەکانی داهێنەشی خستۆتەڕوو.

کۆندرسە، بە شێوەی ناڕاستەوخۆ بوە هۆی سەرهەڵدانی بیروڕاکانی "**مالتووس**" و لە بواری مرۆڤناسیدا و لەئاکامدا لە ڕێگەی مالتووسیشەوە کاریگەری لەسەر تیۆرەکانی داروین دانا.

## کانت (1724-1804ز)

ئادام ئەسمیت لەو بڕوایەدا بوو کەسەرجەم چالاکییەکانم بە قازانجی مرۆڤ تەواو دەبێت. **کانتیش** بەدەس پێکردن لەبیروڕا متافیزیکییەکانەوە بە دەرەنجامێکی لە هەمان چەشن دەگات و ئەوە دەس نیشان دەکات کە "ئەوشتەی کە لەتاکدا بە شتێکی تەمومژاوی و ناڕێك و پێك دەنوێنێت، لە جۆری مرۆڤدا وەك کامڵبوونی بەهرەگەلی سەرەکی دەرئەکەوێت".

بەمجۆرە، بەبڕوای کانت، تیۆری "**ئازادی بڕیاردان**" و ئازادی بیرو چالاکییەکانی مرۆڤ هاوسەنگییەکی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، بە بێ ئەوەی کە هیچ زیانێك لە پرەنسیبی ئازادی ئیرادە بکەوێت. تیۆرە متافیزیکییەکانی "**کانت**"یش، بە شێوەی ناڕاستەخۆ لە بواری مەسەلە کۆمەڵایەتییەکاندا هەندێ بیروڕایان لێ کەوتەوە. کانت بە پیشان دانی ئەوە کە رۆحییەی مرۆڤ ناتوانێت کرۆکی شتومەکەکان بناسێت، بناغەی فەلسەفی ڕێکخراوگەلێکی کۆمەڵایەتی دائەمەزرێنێت کە لەسەر بنەمای نادەمارگیری و رەچاوکردنی "**نسبییەت**"دا دامەزراوە. ئەو، لە پرەنسیبە بە ناوبانگەکانی "**ئاکاری کردەیی**" خۆیدا ئەوەپیشان دەدات کە بە هۆی ئەو هۆکارانەی سەرەوە، ئاکارێکی ئیستدلالی ناتوانێت جگە لەخودی مرۆڤ هیچ ئامانجێکی هەبێت و پرەنسیبێکی لەو جۆرە، ئەو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییانە کە تیایاندا

مرۆڤ دەبێتە قوربانی شتە خەیاڵی و وەهمییەکان، رەت دەکاتەوە. کانت، ئاکاری زۆرەملانەو داسەپێندراو بە مەسەلەیەك لە قەڵەم ئەدات کە وەك ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە وایە. [بە کورتی ئاکار شتێکی پێویستە و دەبێ هەبێت].

## ئەفسانەی چاکەکردنی سەرەتایی

### ژان ژاک رۆسۆ (1712-1778ز)

بیرۆکەی هەڵوشانەوەی سەرەتایی، بناغەی تێزە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی جاخەکانی ناوەڕاست پێك ئەهێنێت و مرۆڤ کە بە ناچار بە بوونەوەرێکی خراپکار و شەڕاشۆ وێنا دەکرا، ئەبوایە بە تەواوەتی دەس بەسەر بکرێت و لە بەرانبەر وەسوەسە جۆراوجۆرەکانیشیدا بپارێزرێت. ئەڵبەتە لەو بەرەنسییانەی کە "مۆنتسکیو" بە باشترین شێوە لێکیداونەتەوە، هەندێ زێدەڕەوی کراوە. بەڵام ئیدی قورسایی دەزگای فشار و جاخی ناوەڕاستی و ڕەشبینی بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ شێوە بیرکردنەوە و تەکنیکی تازەدا نەدەگونجا. ئیمتیازگەلی ئەریستۆکراتیکی سیستمی "کۆرپەراتیو"، پاشماوەی ئابووری جاخی ناوەڕاستی، بە هۆی کۆنترۆڵە رووخێنەرەکانیەوە وەك؛ رەشبینی بەرانبەر هەموو ئازادییەکان، زێدەڕەویگەلی مەزهەبی و قەدەغە کردنە جۆراوجۆرەکان، سزادانی وەحشیانە و درندانە و شکەنجەگەلی بێ مانا، تەنگیان بە خەڵکی هەڵچنیبوو. لە هەموو لاوە دەنگی ناڕەزایی بەرز ئەبووەوە، بەڵام ئەم جۆرە رەخنەگرتنانە، کە گرینگترینیان ئەوەی "والتەر"ە، زیاتر لایەنی نێگەتیفیان هەبوو. وە داڕشتنی تێزێکی رێکخەر ـــ دژایەتیکردنی رەشبینی جاخی ناوەڕاستی کە بتوانرێت رێکخراوێکی تازەی کۆمەڵایەتی لەسەر دابمەزرێنرێت و لە رێگەیەوە بە شێوەیەکی لۆژیکی لە دیکتاتۆرییەتەوە بەرەو ئازادی بڕۆین ـ کەوتبووە ئەستۆی ژان ژاك رۆسۆ.

بناغەی تێزەکەی **ڕۆسۆ**، زیاتر سیکۆلۆژیکییە. باوەڕمەندی ئەو بە چاکەکردنی سەرەتایی، لەهەندێ ڕووەوە بیروڕاکەی **سوقرات**، واتە **"کەس بەئەنقەست خراپکارنییە"** ئەهێنێتەوە یاد. مۆراڵی سۆزنامیزی **"بنتام"** ئاراددیەك کاریگەری لە سەر ئەو بیروڕایەدا هەبوو. دەرەنجامی ئەم بزافە بەربڵاوە فکرییە، کە فیزیۆکراتەکان و پاشان لیبراڵەکانی لەگەڵ ئادام ئسمیت و **"ماندویل"**دا لە گۆشەنیگایەکی پسیکۆلۆژیکی نابووریدا کۆ ئەکردەوە، ئەم پرەنسیبە بوو کە دەبێ متمانە بەمرۆڤ بکەین و لە هەر مەسەلەیەکدا، ڕاستگۆیی و نیەتی چاکەی لەبەر چاوبگرین. هەر بەم هۆیەوە **ڕۆسۆ** لە کتێبی **"ئێمیل"**دا، هەوڵ ئەدات میتۆدێکی تازەی ڕاهێنان کەلەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە **"ئازادی هزر"** ڕاوەستابێت، دابمەزرێنێت.

دوەمین هۆی گرنگایەتی **ڕۆسۆ** لە ڕووی سۆسیۆلۆژیکییەوە ئەوەیە کە تیۆرییەکی تازە بە مەبەستی بنیاتنانی دەسەڵاتیکی **سیاسی پاسایی** پێشنیار دەکات و ئەڵێ، حاکمییەت بە تەواوەتی تایبەت بەخەڵکەو، نە دەتوانرێ بسپێردرێتە کەسی تر و نەدەتوانرێ چاوپۆشی لێ بکرێت. **ڕۆسۆ**، لە **"پەیمانی کۆمەڵایەتی"**دا هەموو ئەو مافانەی کە بۆ تاکەکان دەس‌نیشان دەکرێت، بە شتێکی‌ڕەها لە قەڵەم دەداو کەس بۆی نییە دەستیان تێوەربدات. هەروەها هیچ هێزو دەسەڵاتێك ناتوانێت لە سەرووی تاك و ئازادییە سروشتیەکەیدا لەنگەر بگرێت.

**ڕۆسۆ** بە شێوەیەکی تریش بیر لە چاکەکردنی سەرەتایی دەکاتەوەو بەبیروڕای ئەو، مرۆڤ لە بنەڕەتدا، واتە لە کاتێکدا کە لە باروبۆخی سەرەتایی خۆیدا ژیانی بەسەر ئەبرد، ـــ کە **ڕۆسۆ** و هاوچەرخەکانی (ڕەنگە لە ژێر کاریگەرێتی ناڕاستەو خۆی "تەکامول[29]"دا) بە ژیانی بەهەشتییان دەشوبهاند ـ پاش بوەو پاشان شارستانییەت، ئاکاری پاك و دڵە خاوێنەکەی ناپاك کردووە و لە ناویبردووە. هەڵبەت، دەرەنجامە نێگەتیڤەکانی ئەم تیۆرییە، لە کاتێکدا کە موتەعەسبەکان، بیریان

لەوەکردەوە کە بەزەبری چەك و شمشێر، مرۆڤ بەرەو پاکییەکەی جاران بگەڕێننەوە، شتێکی ئاشکرا و چاوەڕوان کراوە. هەموانیش دەزانن کە "رۆبسپێر" و "سنت ژوست" لە ئوتابییە هەرەچالاکەکانی رۆسۆ بوون.

ژ.ب.ویکۆ (1744-1668)

ویکۆ، خەڵکی ناپل، بە هۆی کتێبەکەیەوە بە ناوی "پرەنسیپەکانی زانستێکی تازە" کە لە ساڵی 1725 دا بڵاو بوەتەوە، بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی مێژوو دەژمێردرێت. بەبیروڕای ویکۆ. گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بریتییە لە، گەڕانەوەی سەردەمە وێکچووەکان (مشابە)، وە بە قسەی خۆی "corsi e ricrci". کە بە "تسپیراڵ"[30]ی دەشوبهێنێت[31]. بە بڕوای ئەو، هەموو گەلان ناچار بە شێوەیەکی یەکسان و دوابەدوای یەك قۆناغ گەلێکی وێکچوو تێ دەپەڕێنن. ویکۆ بەمەبەستی دژایەتی کردنی ڕاسیۆنالیزمی دێکارت، ئەو پرەنسیپەمادییانەی کە هەڵقوڵاوی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانەی مێژوو و بە تایبەت هەڵقوڵاوی گۆڕانی شان بە شانی زمان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانن و خۆی بە فیلۆلۆژی ناودێری دەکات، لەجێی ڕاڤەکارییە سادە و ساکارەکاندا دادەنێت. وە لە ئاکامدا، لەو باوەڕە دایە کە، دەبێ مێژوونووس بە شێوەیەکی دیاریکراو، هاندەری خودئاگا (محرك ذي شعور) لە پراکتیك و واقعییەت جیابکاتەوە.

فەلسەفەی ویکۆ، لە هەمان کاتیشدا کە بەهۆی ئاڵۆزکاوییە سکۆلاستیکیەکانەوە بەئاسانی قابیلی دەرك‌کردن نەبوو، بەڵام تازە و پڕبایەخ بوو.

ئامانجی سیکۆلۆژی ویکۆ، کە بەگەشبینییەکی هاوشێوەی فیزیۆکراتەکان، هەوڵی پەرەپێدانی دەدا، سەلماندنی ئەو

مەسەلەیەبوو کە "تەقدیر، شەهوەت و لایەنە ناهەنجارەکانی مرۆڤیان بە قازانجی شارستانییەت هێناوەتە ئاراوە". هەروەها دامەزرێنەری هەندێ لە پرەنسیپەکانی سۆسیۆلۆژییەو، وەك ئێتنۆلۆژی Ethnologie[32] مۆدێرن، ئەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە نیمە نەفسانەییەکانی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی گەلان. ئەو، وەك مۆنتسکیو سەرنجی نەئەدایە ئەو کارەسات و ڕووداوانەی کەسزاداری فەرامۆش کردن نین، بەڵکوو تەنها گرنگی بە ڕووداوە سەلێندراو و گشتییەکانی مێژوو ئەدا، واتە، ئەو ڕووداوانەی کە پێوەندییان بە ڕێکخراوگەلی کۆمەڵایەتی و جۆری بیرکردنەوەی گەلانەوەههیە. ویکۆ، لە بەرهەمی نووسەرانی رابوردوو کەڵکی زۆری وەرگرتووە، بەڵام بیروڕاگەلی ناخودئاگای ئەو نووسەرانەی کە لە ناو گۆڕانکارییە زمانییەکانیاندا[33] شاردرابوونەوە، بە بایەختر لەبیروڕا گەلی خودئاگا ئاشکرای لە قەڵەم دەدا، بەمجۆرە بە هۆی تێکەڵ کردنی سیکۆلۆژی و لێکۆڵینەوەی رەخنەییانەی مێژوو، میتۆدێکی تازەی هێنایە ئاراوە.

هەروەها ئەتوانین بیروڕاکانی ویکۆ بە پێشەکییەك بۆ باوەڕەکانی ئاگۆست کۆنت و یاسای سێقۆناغ (مراحل ثلاثە) لە قەڵەم بدەین. بەبڕوای ویکۆ، هەرکۆمەڵێك دوابەدوای یەك، بە سێ قۆناغدا تێ ئەپەڕێت. یەکەم،قۆناغی ئیلاهی، واتە شێعر و تیۆلۆژیك و نەفسانە سازی. دووەم، قۆناغی "دڵاوەری و ئازایەتی"، یان قۆناغی زاڵ بوونی سیستەمی ئەریستۆکراتیك و لە راستیدا ئەمە سەردەمی "ئاشیلەکان" و "رەمولوسەکان"ە و، هەندێ کەس خۆیان لەڕیزی دلێران و منالانی خوا دادەنێن؛ سێهەم ، قۆناغی "گەشە سەندنی ئاگایی مرۆڤ"، کە یەکسانی خوازی، بیرکردنەوە، ئیستدلال و ئەرك بەجێ هێنان، لەتایبەتمەندییەکانێتی.

له رووەکانی دیکەوە، ویکۆ لە مێژوونوسانی سەدەی نۆزدەهەم نەچێت. "میشلە" بانگەشەی ئەوەدەکات کە ویکۆ تەنها فێرکاری بووەو ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ویکۆ رۆڵێکی گرنگ و بنەڕەتی بۆ ڕای گشتی قایل بوو. بە بیروڕای ئەو، سوننەتەکان، مافەکان و هەروەها شکڵ و شێوەی زاراوەکان[34]، لە ژێر کاریگەری بیروڕای گشتی دایە. "خەڵك ئەو مانایە بە یاساکان دەبەخشن کە پێیان خۆشەو پەسەندی خۆیانە". دەسەلاتدارانیش، بیانەوێ و نەیانەوێ ناچارن یاساکان بە پێی ئەو مانایانە ڕەچاو بکەن کە خەڵك پێی قایلن. کەواتە، ویکۆ دەکەوێتە ریزی ئەو کەسانەوە کە لە سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا وەك "مۆنتسکیو"، "ڕۆسۆ" و "ئسپێنسێر" هەوڵیان ئەدا گرنگایەتی هزرو ئاگایی کۆمەلایەتی بسەلمێنن. باوەڕی ویکۆ بە ڕۆڵی داهێنەرانەی خەڵك، لە ناو مێژوونووساندا کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لەسەر میشلە دانابوو. پێویست بە باس کردن ناکات کە تازە بوونی بەرهەمەکەی میشلە واتە، "مێژووی فەرەنسە" لەوەدابوو کە زیاتر گرنگی بە ڕاڤە کردنی ڕێکخراوە کۆمەلایەتییەکان و هەروەها بیروڕا و داهێنانی گشتی دەدا، وەك بە پاشایان و وەزیران و کەسانی دەوروبەری پاشا و هەروەها شەڕە جۆراوجۆرەکان.

تەنانەت دەتوانین ویکۆ بە یەکێك لە پێشەنگەکانی تیۆری "جینە کۆمەلایەتییەکان" لە قەڵەم بدەین. ئەو، ئەم تیۆرییەی لە هەموو بوارەکاندا بە دروست و گرنگ زانیوە و لەو باوەڕە دایە کە ڕەوشی سیاسی زۆربەی تاکەکان، دەرئەنجامی ئەو بارودۆخە کۆمەلایەتییەیە کە تیایدا دەژین. ویکۆ دەرکی بە کێشمەکێشە دەروونییەکانی گەلان کردبوو، بەلام پێیوابوو ئەم ناکۆکییانە هەرگیز کۆتاییان نایە چوونکە هەڵقولاوی پێکهاتەی کۆمەلایەتین

نـەك خـودی خـەڵكی. كەواتـە، لـە كـاتی لـە ناوچـوونی هەنـدێ كێشمەكێش و ناكۆكی، ناكۆكی گەلێكی تازە سەرهەڵ دەدەن.

لـەم ڕووەوە، وێكـۆ پشـتگیریی لـە دوو بـیروڕا دەكـرد؛ یـەكێكیان حەتمی بـوونی گۆڕانكـاری و ئـەوی تریـان لیبراڵیـزم، كـە لـە بـواری ڕێكخـراوە كۆمەڵایەتییەكانـدا، لـە ڕووی نابووریـەوە لـە تیـۆری فیزیۆكراتـەكان دەچـێت. بـەبڕوای ئـەو، لـەو ڕووەوە كـە كۆمـەڵگا دەرەنجامی شارەزایی و لێهاتوویيەكی غەریزی و نهێنییە، هـەر بـەو هۆیـەوە، عاقڵانـەترین و جـوانترین ڕەوش بریتییـە لـەوە كـە بەمەبەستی بەدیهاتن و پێشكەوتنی ئۆتۆماتیك و "نازۆرەملانـەی" ئەم لێهاتوویيـە غەریزییـە، دەبـێ لـێبگـەڕێین باشـترین بـارودۆخی پێویست بێتە ئاراوە.

## مۆنتسكیو (1755-1689)

دەتـوانین بڵـێین كـە مۆنتسـكیو بـۆ یەكـەم جـار بـە شـێوەیەكی ڕاستەقینەو یەكجاری، چەمكی یاسای تێكـەڵی زانسـتی كۆمەڵایـەتی كرد. هەمووكەس پێناسكردنە بە ناوبانگەكەی "ڕۆحی یاساكان"[35] نـەزانێت كـە دەڵـێ "یاسـاكان، نیسـبەتگەلێكی پێویسـتن كـە لـە سروشتی شتومەكەكانەوە (اشیاء) سەرچاوە دەگرن".مۆنتسكیو، بە پشت بەستن بەو پێناسەوە هەوڵ نەدات پێوەندی گەلێكی نەگۆڕ لە نێوان ڕێكخراوە سیاسی و قەزاییيەكانی گەلان و بـارودۆخی ژیـان و بە تایبەت ئاو و هەوای ژینگەكەیان دابمـەزرێنێت. بـە بـڕوای ئـەو، مەسەلەكانی پێوەندیدار بە ئـاو و هـەواوە، كاریگـەری لەسـەر ئاكار دادەنێن و هەر بەو هۆیەشەوەیە كە مەزهەبی وڵاتـانی گەرمەسـێر، لـە بەرانبـەر جوانكارییەكانـدا (تزئینـات)و، مەزهـەبی وڵاتـە سەردسـێرەكانیش لـە بەرانبـەر خواردنـەوە مـەسكـەرەكان (مسكرات)دا، نارەزایی دەرنابڕن.

بەبڕوای **مۆنتسکیو**، ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان، پشتیان بە پێوەندییە نەگۆڕەکانی نێوان سروشتی مرۆڤ و ژینگەوە بەستووە و لێرەشەوەیە کە ئەوشتەی کە خۆی بە **"ڕۆحییەی هەمەکی"** ناودێری دەکات ـــ واتە جۆری بیرکردنەوە و بیروباوەڕ ـــ دێتە ئاراوە.

**مۆنتسکیو**، لەکاتی ڕێکخستنی تیۆری دەوڵەت دا ـــ بە پشت بەستن بە بیرۆکەکانی **ئەفلاتوون** لەم بوارەدا ـــ میتۆدە سەرەکییەکان، بە دەرئەنجامی **"ئایدیال"**ە گرنگەکانی کۆمەڵگا لە قەڵەم ئەدات. ئەو، بەم جۆرە ئیستدلال دەکات کە بناغەو پارێزەری هەروو شێوە حکوومەتێك، هەندێ باوەڕن کە گرنگترینیان، ئایدیالی بنەڕەتی و ڕێکخەری ئەو حکوومەتە پێکدەهێنێت. بەوتەی ئەو، پاشایەتی، لەسەربنەمای **"شانازی خوازی ئەریستۆکراسی"**دا ڕاوەستاوەو، لە هەمان کاتیشدا بە خاڵی بەرانبەر و وەك **"ئیستۆپ"**ی ناوخۆیی دەسەڵاتەکەشی دێتە ئەژمار. ڕێکخراوەکانی **"جمهووریەت"** لە سەربنەمای پرەنسیبە ناکارییەکانو، **"دیکتاتۆرییەت"**یش لە سەربنەمای ترس ڕاوەستاوە. کاتێك کە هەستی کاریگەر و بنەڕەتی لاوازببێت، ئەو ڕژیمەش کە لایەنگرێتی، بەرەولاوازی دەچێت و گەندەڵ ئەبێت و بەناچار دەبێ جێی خۆی بدات بە ڕژیمێکیتر: واتە، **ئەریستۆکراسی** ئەگەر هەستی شانازی خوازی تیا نەبێت، ئەگۆڕێت بە جینێکی **ئانارشیست** و هەڵپەرست و ئاژاوەچی. کاتێ کە پرەنسیبگەلی ناکاری لاوازببن، دەبێتە هۆی شێواندن و بە دیکتاتۆر بوونی جمهوورییەتەکان. کاتێکیش کە ترس لە مل هۆڕان کەم بێتەوە، بناغەی دیکتاتۆرییەتەکەیان هەڵئەوەشێتەوە. لەم ڕووەوە **مۆنتسکیو**، وەك چارەسەرێك، پرەنسیبە بەناوبانگەکەی **"جیاکردنەوەی هێزەکان**[36]**"** پێشنیاردەکات، کە بە پێی ئەو ئەسڵە،

هێزەکانی ڕاپەڕاندن، داد، پاسادانان (اجرائیـه، قضـائیه، مقننـه) دەبـێ لـە کارەکانیانـدا سـەربەخۆبن و دەسـتێوەردانی کاروبـاری یەکتری نەکەن.

لە لایەکی ترەوە دەتوانین لە ڕووی سیکۆلۆژییەوە هەمان بیرۆکە یەکسـانیپـەکانی مـەکیاولی و لەهەنـدێ لایـەنی تـرەوە، هـەمان سیکۆلۆژییە ڕەشبینانەکەی ئەو بەدی بکەین. بە ڕای **مۆنتسکیو**، تاکەکانیش وەك کۆمەڵانی خەڵك، هەمیشە ئەو توانایەیان هەیە کە بە شێوەیەکی خراپ کەڵك لە دەسـەڵاتی خۆیـان وەربگـرن، کەواتـە پێویسـتـە دابـەش بکـرێن و بـە هـۆی ڕێکخراوگـەلی تایبـەتی کۆمەڵایەتی و هەروەها داسەپاندنی "هاوسەنگی" لە نێوان هێزەکان و بەرژەوەندییـە جۆراوجۆرەکانیـان دا، ڕێ لـە چـالاکییەکانیان بگیردرێت. وە لـە ناکامـدا **مۆنتسکیو**، لـە ناسەوارەکەیدا بـە نـاوی **"چەند تێبینییەك سەبارەت بە مەزنایەتی و هەڵوەشانەوەی ڕۆمییەکان"** دەڵێ، گۆڕانی شێوە بیرکردنـەوەو ڕووخـان و توانـەوە سیاسییەکان، کاریگەرییەکی تەواویان لەسەر ڕووداوەکانی مێـژوودا هەیە. بەوتەی ئەو، شارستانییەتەکان کاتێك لـە نـاو دەچـن کـە لـە پرەنسیبەکاندا زێدەڕەوی بکەن.

## بەشی سێهەم

# سەردەمی هاوچەرخ

### ڕەشبینەکان (*Pessimistes*)

فیزیۆکراتەکان و ئابووریزانە لیبراڵەکان کە هەندێك، تێزەکانیان کامڵ کردبوون، لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا سەرکەوتنێکی یەکجار مەزنیان بەدەست هێنا. سیستەمە سەندیکاییەکان و نرخ دانان لەسەر کاڵاو خزمەتگوزارییەکان و هەروەها "مقررات"ی ئابووری، بەلانی کەمەوە لە وڵاتە خۆرئاواییەکاندا لە ناوچووبوون، یان ڕەت کرابوونەوە.

لەم سەردەمەدا، سەروەت و سامان و مەسەلەی بەرهەم هێنان، پێشکەوتن و گەشەکردنێکی تاڕادەیەك زۆری بە خۆوە دیوە کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وێنەی نەبوە. بەڵام ئەم دینامیزمە ئەفسانە ئاسایە، شێوەیەکی تریشی هەبوو: هەژاری چینی کرێکار لە هەموو شوێنێکدا گەیشتبووە ئەو پەڕی خۆی و "کلر"یش دۆخێکی تاقەت پڕووکێنی لە خۆگرتبوو و لیبراڵیزمی ئابووریش جۆرە کێبەرکێ(رقابت)یەکی هەوسارپچڕاوو کوشندەی لێ کەوتبووەوە. شیاوی باسە کە ئەو کێبەرکێیە، بە تایبەت لە کاتی هەناردنی کاڵا بۆ بازارە بیانییەکان زیاتر دەبوو.

پاشماوەی شێوە بیرکردنەوەی بازرگانانە، کە لیبراڵیزم نەیتوانیبوو خۆی لێ ڕزگار بکات، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ڕوودانی یەکەم شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیادا. واتە، وڵاتێك کە لەچاو بەرهەمهێنانی کشت و کاڵی (فلاحتی)خۆیدا، جەماوەرێکی زیاتری هەبوو وبکەوێتە بۆ تێرکردنی ئەو

جەماوەری خۆی، پێویستی بە هەنارده وناوردەی کالا و خواردەمەنی هەبوو.

"مالتووس" و "ریکاردۆ"دەرکیان بە هەندێ لە دەرەنجامە کوشندەکانی دینامیزمی ئابووری لیبرالّ کردبوو. ئەم دوو کەسە بۆ یەکەم جار کاریگەرییان لەسەر گەشبینی ئیکۆنۆمیستە دەمارگرژەکاندا دانا. ئەو مەسەلە گرنگەی کە ئەوان باسیان دەکرد، "رژدی" سروشت بوو. یاسای "داهاتی هەمیشە دابەز[37]" لە بواری کشتوکالّدا کە ئەوان جەختیان لەسەر دەکرد، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە؛ کاروکۆشش هێندە زۆرە کە ئەگەرچی بەرادەیەکی یەگجار زۆریش پێوەی خەریك بی، هیچ فایدەیەکی نابێت. "یاسای داهات"ی مالتووس و ریکاردۆ، ئەوە دەرئەخات کە بەرژەوەندییەکان هەرچی زیاتر بن، هێندەش نەگونجاوتر ونامەشرووع ترن. وە لە ئاکامدا "یاسای جەماوەر"ی "مالتووس"، (لەگەلّ "یاسای داهات"دا) نەیویست ئەوە بسەلمێنێت کە سروشت، بە هۆی نامرازە توندوتیژی نامێزەکانیەوە بەرگری دەکات لە مەسەلەی زاوزێ کردن کە ئەوەش دژوازی و دەمەقرەگەلێکی زۆری لێ بوەتەوە. ماوەیەك دواتر "داروین"یش توندوتیژییەکانی هەلّقولاوی هەلّبژاردنی رەگەزنامە (شجرة) و رەسەنایەتی و مانەوەی بوونەوەری بالاتری خستۆتە بەرباس و لێکۆلّینەوە. بەکورتی، گەشبینی خەیالاوی تێزەکانی سەدەی هەژدەهەم، لە ناو ئەم بیرۆکە تاریکانەو هەروەها لە ناو کوشت و برە گەورەکانی جەنگە ناپلیۆنییەکاندا لە ناو چوو؛ کەواتە، پیاچوونەوەی ئەم بارودۆخە زۆر پێویستبوو.

## کۆنەپەرستی دژە ئۆمانیستی

کلێسەی کاتۆلیك، سیمایەکی گشتی و جیهانی هەبوو، پاشان ئاکارو تایبەتمەندییەکانی رێنسانسیشی خرایەسەر. بەلام شان بە شانی ئەوە لە سەردەمی "لۆتێر"دا کۆنەپەرستییەکی چاخی ناوەراستی و ناسیۆنالیستی سەری هەلّدا. بەم جۆرە فەلسەفەی ئیستدلالی و جیهانی و گەشبینانەی

سەدەی هەژدەهەمیش بۆ خۆی هەندێ کاردانەوەی لێ کەوتەوەو، ئەوەش سەرنج ڕاکێشە کە زۆربەی ئەوکاردانەوانە لە ئەڵمانیادا بەرچاو ئەکەوت.

فەیلەسووفانی سەدەی هەژدەهەم، بەراشکاوی و لێبڕاوییەکی زیاتر لە فەیلەسووفانی رێنسانس ئەوەیان رادەگەیاند کە پرەنسیب و لۆژیکێکی هەمەکی (کلی) لە جیهاندا هەیە کە لای هەموو ئینسانەکان بە گشتی(بەهەموورەگەزێکەوە) بایەخێکی یەکسانی هەیە.بەڵام "هێردێر" Herder (1744-1803ز) جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە هەموو گەلێك خەسڵەتگەلی تایبەت بە خۆی هەیە و تاکەکانیشیان بە ناچار جۆرە بیرکردنەوەو ئیحساسگەلێکی تایبەتیان هەیە کە ئەوانیتر ناتوانن دەرکیان پێبکەن.

لە دیدگای ئۆمانیزمدا، ئەرزشی هەر تاکێك گرێدراوە بەسیفەتە شەخسییەکانییەوە، لە کاتێکدا کە بە پێی فوتابخانەکەی هێردێر،ئەو ئەرزشە گرێدراوە بە چۆنیەتی رێکخراوگەلێکەوە کەتیایدا بەشدارە. هێردێر، لە سەرازیۆرگدا بۆ گۆتە ــ کە ئەودەم شاعیرێکی لاو بووــ وای ئیستدلال ئەکرد کە شیعرگەلی رەمەکی و حەماسەکان و هەروەها مافە سەرەتاییەکانیەکگەلێکی سادە نین،بەڵکوو ئۆرگانیزمێکی زیندوون کە شێوەیەکی ناخودئاگا "رۆحێکی کۆمەڵایەتی" یان تیایەو ئەمەش هەمان "رۆحی نەتەوەیی" (Volkeigeist)ە. ئەم وشەی دواییە بۆ یەکەم جار "هێگڵ" لە ساڵی 1793 دا لە نامیلکەی دۆکتۆراکەی خۆیدا هێناویەتی. ئەم رۆحە نەتەوەییە، چوارچێوەی دەوڵەتەکانی تێپەڕاندو وشەکانی volktum و Nationalite نزیکەی ساڵی 1810 بە هۆی "یاهن"ەوە (jähn) چوەناو زمانی ئەڵمانی و دواییش بە هۆی "مادام دۆشتال"ەوە، چوە ناو زمانی فەرەنسییەوە. ناوبراوان ئەم دوانە، Nationalite یان بە ئۆرگانیزمێکی گەورە دەشوبهاند کە تاکەکان "وەك گەلاگەلی دارێك" وان {و بە کورتی بەشێکن لەو ئۆرگانیزمە} . لەوە بەدواوە، شوبهاندنی کۆمەڵگا و دەوڵەتەکان بە ئۆرگانیزم، لایەنی هاوبەشی هەموو سۆسیۆلۆژییە کۆن

پاریزەکان بوو. واتە، بەم جۆرە دەیانویست بڵێن کە کۆمەڵگاو دەوڵەتەکان، تەنها بە شێوەی ئۆتۆماتیك و بە بێ ئەوەی کە ئیرادەی و خاوەن ئاوەز، کەمترین کاریگەری لە سەریان هەبێت، دەتوانن گەشەبکەن و کامڵ ببن و ، ئەمەش لە راستیدا، پەرچەکردارییەك بوو لە بەرانبەر زێدەڕەوی گەلی توندڕەوە راسیۆنالیستەکاندا.

دەتوانین بە ئاسانی دەرەنجامی سۆسیۆلۆژیکی پرەنسیپەکانی "هێردر" دەرك بکەین. ئەم پرەنسیپانە، لە راستیدا "گەڕانەوەیە بۆ تاریکی" سکوولاستیکەکان و لەگەڵ ئەوەشدا، پرەنسیپە کۆنەکان و، هەروەها ئەو مەسەلانەیان کە شایانی ئیستدلال لەسەر کردن و وێناکردن نین، بە بایەختر لە ئیشکاری و راڤەکاری و شعوور و ئیستدلال دادەنا. لە رووی مێژوویی و سیاسییەوە، ئەم تێزانە بواریان بۆ دیاردەیەك رەخساند ـــ واتە، رەچاوکردنی "میللەت" وەك یەکەیەکی (واحد) عیرفانی و نیمە مەزهەبی. واتە، گەڕانەوە بۆ رێکخراوە ساواکانی خێڵە سەرەتاییەکان، بە شێوەی ناڕاستەوخۆ ـ کەدواتر بە ناسیۆنالیزم ناسرا.

## کاردانەوەی دژەلیبرال

ئەم جۆرە کاردانەوانە لە بواری مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانیشدا رووی دا. فیزیۆکراتەکان و لیبراڵەکان، خوازیاری سڕینەوەی جەبری ئابووری عیرفیی، واتە کۆرپوراتیزم (سیستمی سەندیکایی) و هەروەها کۆیلەتی و کار پێکردنی زۆرەملانە بوون.(کارکردنی لەو جۆرە تەنانەت تاسەدەی هەژدەهەمیش لە گوندەکانی بەریتانیادا باوبوو) ئەم دیاردەیە (واتە، کاری زۆرە ملانە) لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە لە سەرشانی خەڵك قورسایی ئەکرد. لە بواری بازرگانی و ئاڵوگۆڕی کاڵاو شتومەکیشدا دژایەتی "دیریژیسم[39]"ەکرد و لایەنگری رەوتی ئازادانەی کاڵا و پارەو هەروەها بە گشتی دژی ئەو رێکخراوانەبوون کە کاری بازرگانییان دەکرد.

یەکەم دەنگێك کە لە دژی ئەم دیدگاگەلە دەربڕا، دەنگی فیشتە (فیختە) (1760ـــ 1814ز) بوو، کە زیاتر وەك فەیلەسووفێك دەناسرێت و لە

کتێبەکەیدا بە ناوی "دەوڵەتی بازرگانێتی بەرتەسک" تیۆرییەکی هەمەلایەنەی بۆ پاشایەتی دیکتاتۆر هێناوەتە ئاراوە، کە بە پێی پێشنیارەکانی، هەموو گەلێك ئەبێ پشت بە خۆیەوە ببەستێت و تەنها بەرهەمە ناوخۆییەکانی خۆی مەسرەف بکات و لە هەناردەو هاوردە خۆ بپارێزێت. تەنانەت سەفەرکردن بۆ "مەنفا" بە شتێکی ناڕەوا دەزانێ و لەو باوەڕەدایە کە گەڕیدەکان، بە "پیشان دانی بێکاری و بەرەڵایی خۆیان" خەڵکی ئاسایی بەرەوگەندەڵی هان دەدەن.

دوای ماوەیەك، کاتێ کە پرەنسیپی بازرگانێتی و ئاڵوگۆڕی ئازادانەسەرکەوتنی بەدەست هێنا، دیسانەوە لە ئەڵمانیدا کاردانەوەیەکی تازە بە شێوەی "پرۆتکسیۆنیزم"[40] و ناسیۆنالیزمی ئابووری هاتە ئاراوە کەلیست بەرجستەترینی ئەو دژایەتی کەرانەبوو.

لە لایەکی ترەوە، سیستمی کۆمەڵایەتی ئەورووپا، کە میراتی چاخەکانی ناوەڕاست بوو، لە رووی زنجیرە پلەو پایەوە، لە سەربنەمای پرەنسیپ گەلێکی ئاڵۆزو زۆربەی کات دژبەیەك راوەستابوو.لەگەڵ ئەوەشدا پاشماوەی سیستمی سەندیکایی ئیمپراتووری رۆمای رۆژهەڵاتی تیا بەدی دەکراو هەروەها ئەو پرەنسیبەشی خرابە سەر، کەخەڵك دابەش بکرێت بە سێ بەشی:چینی ئەریستۆکراتىرۆحانی و خەڵکی رەمەکی.بەڵام چەمکی"نەجیب زادە"هەرگیز بە تەواوەتی روون نەبوەوە.لە لایەکەوە دەیانویست چینی ئەریستۆکرات بگۆڕن بەچینێك کە بە تەواوەتی بەرووی ئەوانیتردا داخراو بێت و رێگە بەهیچ کەس و چینێکی تر نەدرێت.لەگەڵ ئەوەشدا لە ولاتە سەلتەنەتییەکاندا ،پاشایان بۆ هەرکەسێك بیانویستایە، پلەوپایەی نەجیب زادەییان ئەبەخشی و بە هیچ شێوەیەکیش لەو مافانەی خۆیان چاوپۆشییان نەئەکرد.

ئەو هێرشە توندانەی لەسەدەی هەژدەهەمدا کرایەسەر ئیمتیاز گەلی ئەریستۆکراتەکان، بزاڤێکی دیفاعی هێنایە ئاراوە کە پێکهاتەیەك بوو لە تێزگەلێکی جۆراوجۆر.

له فەرەنسەدا، ئیستدلالی سەرەکی ئەو کەسانەی کە داکۆکییان لە ئەریستۆکراتەکان دەکرد، ئەوە بوو کە ئیمتیازەکانی جیتی ناوبراو، هەڵقوڵاوی ماف سەرکەوتنی ڕۆڵە راستەقینەکانی "فرانك"مکانە.... ، واتە رەگەزی سەرکەوتووان. دواتر، ئەم تێزە کە زیاتر لە لایەن "ئابەدونوا" و "بولن ویلیە"وە پشتیوانی لێنەکرا، لە لایەن "گۆبینۆ[42]"وە بە ئیستدلال گەلی کۆمەڵناسی و مێژوویی کەلکی لێوەرگیرا. ئەڵەمانییەکانیش بە حەزو تاسەیەکی یەکجار زۆرەوە، پێشوازییان لە "گۆبینیزم"کرد. گۆبینیزمێك کە لە راستیدا بە پێی ویستو داخوازی ئەوان، ئاسانکاری تیا بەدی هاتبوو و وردەوردە لە ئاسیۆنالیزمی "ویلهۆلم"ەوە تێی پەڕاندو گۆڕا بە تا رەگەزپەرستی دێوانە ئاسای نازییەکان[43].

## بارودۆخی تازەی مەسەلەکانی کۆمەڵناسی، پاش شۆڕشی فەرەنسە

### جەنگە ناپلیۆنییەکان و شۆڕشی پیشەسازي

ئەم ڕووداوانە بوونە هۆی بڵاو بوونەوەی ئەو ئایدیا یەکجار دیمۆکراتیکانەی کە دەرەنجامی فەلسەفە گەش بین ئەکەی سەدەی هەژدەهەم بوون. گەش بینی لیبراڵ، و باوەڕی رۆسۆ بە ئاکارە چاکەکانی خەڵك، کە بە بڕوای ئەو، تەنها سەرچاوەی دەسەڵات و حاکمییەتی مەشرووع بوون، لە ناو ئەو ئایدیانەدا دەبینرا. ئەم باوەڕەشیان خرابوە سەر کە پاشاکان، هۆکاری لێك‌جیابوونەوەی گەلان و هەروەها تەنها داگیرسێنەرانی جەنگن و، دوای لەسەرکار لابردنیان "گەلانی سەرانسەری جیهان، لەبەر چاوی ئەو ملهوڕانەی کە لەسەر حکوومەت لابراون، لە بەرانبەر جیهانێکدا کە حەساوەتەوەو هەروەها لە ژێرئاسمانێکی ساماڵ و جواندا یەکدی لە ئامێزدەگرن[44]".

بەڵام سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن و داگیرکردنی سەربازی درێژخایەنی وڵاتان، وەك دەستدرێژی و داخوازگەلێکی نائاسایی، هەستی نەتەوایەتی

هەمووﻻیەکی بزواند و تینێکی زۆری بەخشی بە تێزەکانی هێردێر، کە لە نەدەبیاتدا گرنگی تایبەتیان پێدرا. لەوە بەدواوە ڕۆمانتیکەکان دەستیان کرد بە دژایەتی کردنی هزرمەندانی سەدەی هەژدەهەم و گرنگییەکی تایبەتییان دا بەو شتانەی کە لەواقیعدا پێناسەی هەر گەلێکن؛ واتە ئەفسانە دێرینەکان، سوننەتگەلی چاخی ناوەڕاستی و پەرەستنی پاڵەوانە دێرینەکان و... .

کەواتە ناسیۆنالیزمی تازە پێڕەوکە، کاردانەوەیەکی گشتی بوو لە دژی "**کۆسمۆپۆلیتیزم**"[45]ی چینەدەسەڵاتدارەکانی سەدەی هەژدەهەم و لە هەمان کاتیشدا، زەربەیەك بوو لە دژی ئۆمانیزم.

## ڕۆمانتیکی جەبری

هێگڵ (1770-1831ز) فەراهەم کردنی ڕێگەی گواستنەوەی متافیزیکی ڕۆمانتیکی بۆ بواری زانستی کۆمەڵایەتی دەست پێکرد. ئەویش وەك فەیلەسووفەکانی تری ڕۆمانتیك لەو باوەرە دابوو کە لەسەرووی هەر فیکرێکی بە ناوەزدا، توخمێکی باڵای عیرفانی هەیە. بناغەی ئەندیشەی هێگڵ ئەوەیەکە بەرهەمهێنانی عەقڵانی و هەروەها واقعییەت، بە دیاردەگەلێکی یەکسان لە قەڵەم ئەدات و بایەخێکی وەك یەکیان بۆ قایلە.

بە بیروڕای ئەو، "بوونەوەر و فکر" وەك ئەسڵێکی واحد، واتە "ئایدیا" وان. بە ڕای ئەو، بەمەبەستی باش تێگەیشتن لە گۆڕانکارییە مێژووییەکان، دەبێ کەڵك لە "دیالکتیك"وەربگرین. ئەم دیالکتیکە، شێوە بیرکردنەوەیەکی فەلسەفییە کە ڕۆمانتیکەکان پێیان وایە بە تەواوەتی شتێکی جیا لە ناوەزی کردەیی ئاساییە، بەڵام ناتوانن ئەوە دەس نیشان بکەن کە، ئەم بیرکردنەوە لە کوێوە دەستی پێکردووە و چۆن کۆتایی پێدێت. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەکە بەویستی خۆیان ئەو بیرکردنەوە ئاڵ و گۆڕی بکەن.

دیالکتیك، لەسەر بنەمای "دژوازی"یەکان دا ڕاوەستاوە. بە وتەی **هێگڵ** ناتوانین چەمکێك وێنا بکەین و لە هەمان کاتیشدا لایەنە بەرانبەرەکەی

لەبەرچاونەگرین. سەبارەت بەم مەسەلە، سێ‌دەرەنجاممان دەس دەکەوێت؛ تێز، لەنتی تێز، سەنتێز[46]. هەروەها نەتوانین بەویستی خۆمان ئەو دژوازییانە دەسنیشان بکەین. چوونکە بەقسەی "دورکیم" چەمکی "دژوازی" دەرەنجامی داوەرییەکانی ئێمەیە سەبارەت بە شتومەکەکان. واتە لە ڕاستیدا "فی‌نفسە" هیچ نەیارێك لە ئارادانیە. "بگرووس" لەهەمان کاتدا کە فەیلەسووفێکی لایەنگری هێگڵە، ئەویش لەسەر هەمان باوەڕەو "دیالکتیکی جیاوازییەکان" لە بری "دیالکتیکی دژوازییەکان" پێشنیار دەکات.

بەلام چەمکی "سەنتێز"یش زۆربەی کات شتێکی ئیختیارییەو وەك جۆرە ئامرازێك بۆ "ڕێککەوتن" هەلبژێردراوە. هەلبەتە ڕێککەوتنی لەجۆرە، زۆرجار روودەدات بەلام بە دلنیاییەوە ناتوانێت جیهانی و گشتی بێت. چوونکە، بۆ نموونە، زۆربەی داهێنانەکان دژی یەکن و یەکتری رەت ئەکەنەوە. هەروەها ئەبێ "نیسبەتە یەکجار بگۆڕەکانی پێك هێنەری هەر سەنتێزێك" لەبەر چاوبگرین، ئەگینا ئێدی شتومەکە ناهاوچەشن و لێك جیاوازەکان تێکەڵی یەکدی دەبن. بە کورتی، دیالکتیکی هێگڵ، بە بانگەشەکردنی ئەوەکە تێڕامان و لێکۆڵینەوە لەسەرووی هەموو شتەکانەوەیە، زۆربەی کات بە کایەیەکی سادەی زمانی کۆتایی پێ‌دێت. بەلام لەم ڕێگەیەوە ئەتوانین ئەوشتەی کەدلخوازی ئینسانە، بە شێوەی متافیزیکی بسەلمێنین و بە هۆی پێوەندی کردن بە عەقلێکی هەمەکی (ئایدیا)یەوە، روخسارێکی فەلسەفی بە خواستەکانمان ببەخشین.

بەبیروڕای زۆربەی فەیلەسووفانی رۆمانتیك، "گەورە پیاوان" بەدرێژایی مێژوو، نوێنەری "ئایدیا" بوونەو، هەروەها ئینسانانێکی بەرجەستە و پیشاندەری حەقیقەت بوونە. لەم رووەوە، هێگڵ و پیڕەوانی، هەمیشە بەدوای ئەو قارەمانانەدا دەگەڕان کە تەقدیریان لە گەلدا بوەو توانیویانە سەرکەوتن گەلێکی باش بەدەست بهێنن. بۆ نموونە "کارلایل" پاش

"فیشته" وای نووسیوه: "مێژووی گەورە پیاوان، رۆحی مێژووی جیهانییە".

ئێستا، ئەو مەسەلەیە ماوەتەوە کە "هێزی بێسنوور" لە چ کەسایەتییەکدا سەرهەڵئەدات؟ بە بیروڕای هێگڵ ئەو مەسەلەیە یەکجار سادەیە و لەو بارەوە ئەڵێ: پیاوی بەڕاستی گەورە، ئەو کەسەیە کە هەمیشە سەرکەوتوو بووە. سەرئەنجام، "هێگڵ"یش ڕێزێکی یەکجار زۆر قایل بوو بۆ ئەو کەسانەی کە بە هەرشێوەیەکی شیاو، دەسەڵاتدار بوون و دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو. ئەو، ناپلیۆنی لە کاتی داگیرکردنی ئەڵەمانیادا ستایش کردو، بە سوارچاکێك ناودێری ئەکرد کە "رۆحی جیهان" بوو(!؟). پاشان کاتێك کە ئیمپراتووری پرووس پێك هات، رایگەیاند کە رۆحی مێژوو لە ناو بوروکراسی پرووسدا سەری هەڵداوە. بەڵام ماوەیەك دواتر ئەوقارەمانانەی کە هەمیشە هیوایەتی پێیان هەبوو، بەو هۆیەوە کە "بەخت" تاسەر لە گەڵیاندا یار نەبوو، برێك لەسەرخۆتر و بەپارێزتر باسی لێوە دەکردن و تەنها بە شێوەی گشتی ستایشی دەوڵەتی دەکرد و هەروەها ستایشی ئەو هێزو "قەدەر"ە یاساییەی کە پشتیوانیدەوڵەت بوو. سەرئەنجام ستایشی جەنگی کرد، چوونکە بە قسەی خۆی، دەوڵەت تەنها لە رێگەی جەنگەوە ئەتوانێت بە باشترین شێوە "بوونی" خۆی دەرك بکات".

هێگڵ رۆحی کاریگەرو چالاك و بەردەوامی "خەڵك"یش ئەهێنێتە نێو بازنەی ئەندیشەکانی و کەواتە جۆرە "فاتالیزمێکی مێژوویی" دێنێتە ئاراوە. بە هۆی ئەم فەلسەفەیەی هێگڵەوە دەتوانین ئیستدلال بکەین کە هەموو رووداوێکی مێژوویی — هەڵبەتە پاش ئەوەی کە رووبدات — بە شێوەیەکی حەتمی هەڵقوڵاوی لۆژیکی لە دایك بوونی مێژوویە. لەم روەوە، سەرجەم تەقەلاکانی هێگڵ بۆ سەلماندنی ئەوە تەرخان کراوە کە شتێك کە رووی داوە، حەتمەن ئەبوایە رووی بدایە [واتە لە تەقدیریدا هەبووە].

فەلسەفەی رۆمانتیزم و بە تایبەت هێگڵیانیزم، مەترسی پشت بەستن بە هێزە نادیارەکانی وەك، فاتالیتە، بەهرەی رەگەزی و... بە باشترین شێوە

پیشان دەدات. سۆسیۆلۆژی راستەقینە دەبێ خۆی لەو بوتە متافیزیکییانە بپارێزێت و بە تایبەت خۆی بە دەقیقترین ئامرازگەلی رەخنەگرتن تەیار بکات. سۆسیۆلۆژی هێگڵ، لە جیاتی روون کردنەوەی مەسەلەکان، بە پێچەوانەوە ئاڵۆزتریان ئەکات. جیا لەوەش، بە زنجیرە کۆت و بەندگەلێکی گەورەی مەزهەبی کۆتایی پێدێنێت؛ واتە، پەرۆز راگرتنی مێژوو و رووداو پەرستی" لە جێی تەسەوفی مەزهەبیدا، دائەمێنێت. رەنگە هەر ئەم مەسەلەیە، ئەم وەهمە بێنێتە ئاراوە کە ئینسان لەو رێگەیەوە دەرك بە هەموو شتێك دەکات. هەڵبەت رەنگە ئەم وێنایە، هێمنایەتییەکی رۆحی بهێنێتە ئاراوە، بەڵام هەرگیز تەنانەت یەك هەنگاویش ئینسان ناباتە پێشەوە.

## گەڕان بەدوای زنجیرە پلەوپایەگەلێکی تازەی کۆمەڵایەتیدا

"ژۆزف دۆمەستێر" (1753-1821ز) نووسەرێکی سیاسییە کە نووسینەکانی زیاتر، تەرخان کراوە بۆ داکۆکی کردن لەتێزێکی کۆن پارێزانە. دۆمەستێر، بە توندی دژی هەندێ لە لایەنە نائەزموونی (غیرتجربی) و نامادییەکانی فوتابخانەی رۆسۆ و جێبەجێکردنی بیروراکانی بوو (کە گرنگترین نموونەیان یاسای بنەڕەتی 1793 بوو، کە هەرگیزیش نەخرایە بواری جێبەجێ کردنەوە). هەروەها بە توندی دژایەتی ئەو خواستە شۆڕشگێڕییەی دەکرد کە بە نیاز بوو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی رابوردوو بە تەواوەتی هەڵوەشێنێتەوە. ئەو، میتۆدی تەجروبی بۆ رافەکردنی کۆمەڵگاکان بە شتێکی یەکجار بەکەڵك لە قەڵەم ئەداو هەر بەو هۆیەشەوە، هیچ سازگارییەکی لەگەڵ راسیۆنالیزمدا نەبوو، ئەوەشی نەوت کە دەبێ هەموو مەسەلەکانی پێوەندیدار بە چییەتی کۆمەڵگاوە، بە هۆی مێژووەوە چارەسەربکرێن.

بەڵام سەبارەت بە "دەسەڵاتی نەتەوەیی"، دۆمەستێر بەرافەکردنی ئەزموونە مێژووییەکان لەو باوەڕەدا بوو کە "دەسەڵاتدارێتی"، سەرچاوەیەکی نائاسایی (خارق الطبیعي) نییە و بەشێکە لە"سیستەمی

غەریزی کۆمەڵگاکان". دۆمستێر، وەك نوێنەری تیزی "لۆژی ئیمیزم[47]" دەناسرا، ئەویش لە کاتێکدا کە ئەم وشە، جگەلە "زنجیرەی پاشایەتی پێشوو "هیچ مانایەکی دیکەی نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ سەرنجێکی بەوە نەئەدا کە وەك چۆن هەموو تیزێکی سیاسی لە دوارۆژەکردندا، لە ناو تیۆرییەکی حەقانییەتی دەسەڵات و حکوومەتدا ئەتوێتەوە. بەو شێوەیەش، دوایی هاتنی وەچەیەك، ئەو بوارە دەرەخسێنێت کە چینی زاڵ و دەسەڵاتدار، هەندێ مافی تایبەتی بۆخۆی قایل بێت و بانگەشەی ئەوە بکات کە مێژوو بە قازانجی ئەو "حوکمێکی نەگۆڕ و سەقامگرتوو"ی ئیمزا کردووە.

بە هەر حاڵ ئەندیشەکانی "ژۆزف دۆمستێر" یەکجار ئاڵۆزن و، لە هەندێ روەوە لەئەندیشەی لیبراڵەکان دەچن. واتە وەك ئەوان، باوەری هەیە بە چالاکییە خۆرسکییەکانی مرۆڤ و هەروەها ئەوەش کە ئینسان قابلییەتی ئەوەی هەیە کە بە شێوەیەکی عاقڵانە ئامانجەباڵاکانی ژیانی تیا بەدیبێنێت. دۆمستێر بە توندی دژایەتی ئەورەخنانەی ئەکرد کە قوتابخانەی رۆسۆ، بە بیانووی ئاکارەوە، رووبەرووی شارستانییەت، کامڵبوون، هونەرو داهێنانەکانی ئەکردەوە. لەو باوەرەشدابوو کە پێشکەوتن و داهێنانەکان (اختراعات)، مرۆڤی لە سروشت دوورنەخستۆتەوەو. بە پێچەوانەوە نزیکتری کردۆتەوە. چوونکە "هونەر، خودی سروشتی مرۆڤە"، ئەوەشی ئەوت کە ئەگەر "چالاکییەکانی مرۆڤ زیان لە یاسا سروشتیەکان بگەیەنن، کەواتە دەبێ کوڵانەنی هێلکەیەکیش بەلادان لە یاساکانی سروشت لە قەڵەم بدرێت". ئەو باوەری بە هاوسەنگی کۆمەڵایەتی هەبوو، لە هەمان کاتیشدا، باوەریشی بە یاساگەلی رێکخەری کۆمەڵگان هەبوو و پێی وابوو یاساگەلی ناوبراو ئەو توانایەیان هەیە کە لەو رێگەیەوە ئەتوانن تێکەڵی چالاکی گەلی هۆکارە ئازادەکانیش ببن".

## سنت سیمۆن (1760-1825ز)

لـه راسـتیدا ئەریسـتۆکراتیکی راسـتەقینەو مـیراتبـەری (وارث) بیۆگرافیست(ژیاننامەنووس)ی بەناوبانگی دەرباری "لوویی چواردەهەم"و، بە پێی بانگەشەی خۆی، یەکێك بـوو لـە پێرەوانـی "شارلـمانی". ئـەویش وەك دۆمستێر، لە سەردەمی بزاوتەکانی شۆڕشی فەرەنسـەدا، ئەندێشەکانی ئارادمیەکی زۆر پوخـت و کامـڵ بووبـوون، بـەڵام لـەبری ئـەوەی کـە وەك دۆمسـتێر "شـۆڕش" بـە هەڵەیـەکی نەبەخشـراو لـە قەڵـەم بـدات، بـە پێچەوانەوە بە پاسایەکی گشتیەوە دەیبەستەوە. بە بیروڕای سنت سیمۆن، مێژووبریتییە لە دوابەدوای یەکداهاتنی (توالی) ئەو قۆناغە ئۆرگانیکانـەی کەتیایاندا، هاوسـەنگی و متمانـە پـێبوون و یـەکگرتوویی بەسـەریاند زاڵە. بریتییـە لـە قۆناغـە قەیرانـاوییـەکان کـە تیایانـدا هـەموو شـتێك ـــ تـا دۆزینـەوەی هاوسـەنگییەکی کۆمەڵایـەتی و فکـری جێگـر و هـەروەها سـەرهەڵدانی زنجیـرە پلەوپایەگـەلێکی تـازەی پاسـایی و نـەگۆڕ لـە زەمینـی خەڵکیدا ـ رووبەڕووی کێشە بۆتەوە. پاشان سنت سیمۆن، بەسەر شۆڕشی 1789 دا بـاز نـەدات و نـەتها وەك "پێشـەکی" یـەك لـە قەڵـەمی نـەدات و هیچیتر. چوونکە بەڕای ئەو، هۆکارێك کە بە تـەواوەتی روخساری جیهانی گۆڕیوە، شورشی پیشەسازییە. لەو بڕوایەشدایە کە لەمـەودوا بیرمەنـدان و هەموو ئەو کەسانەیکە سەرقاڵی کاروبـاری پیشەسازین، دەبێ پلـەیان بـۆ قایـل بـین و زنجیرە پلەوپایـە تـازە کۆمەڵایەتییـەکانیش نـەبێ لەسەر ئـەم پرەنسـیبە بنیـات بنـرێن. بـە کـورتی پێـیوابـوو "ئەگـەر بەدبـەختییـەکی مەترسـیدار رووی بدایـەو گـەورەترین کەسـایەتییەکانی بنەماڵـەی سـەڵتەنەتی و هـەروەها وەزیـران و دادوەرە پایەبـەرزەکانی لـە نـاو بردایـە، فەرەنسییەکان دەگریـان، چـوونکە دڵناسکن. بـەڵام لەڕاستیدا، ئاژاوەیـەکی راستەقینە لەناو کۆمەڵانی خەڵکیدا نەدەهاتە ئاراوە. ئەوە لە کاتێکدایە کە تیاچوونی کتـوپڕی بیرمەندان، پیشەسازان و بانکدارە گەورەکان، کۆمـەڵگای تووشـی زیـانێکی زۆر ئـەکرد، چـوونکە دۆزینـەوەی جێگرێـك بـۆ ئـەو

کەسایەتییانە کارێکی ئاسان نییە" ـسنت سیمۆن، بەم ڕستەیە ـ کە لەسەر ئەوە ماوەیەك لە زیندان خرا ـ ئەیەویست ئەوەیشان بدات کە زنجیرە پلەوپایـــە کۆمەڵایەتییـــەکان، لەڕاســـتیدا تووشـــی گـــۆڕان بووبـــوون. پێشکەوتنەکانی زانست و پیشەسازی و چالاکی گەلی پێوەندی پێوەکردن (فعاليتهـاي ارتبـاطي) و بازرگـانیش، لەچـاو "حکوومـەتی ئاکەکانـدا" گرنگییەکی زیاتریان بە "حکوومەتی شتومەکەکان" دەبەخشی. لەم ڕووەوە، مەســەلەی ســەرەکی، ڕێکخســتنی بەرهـەمهێنانی ئابوورییــە بــە قــازانجی هـەموان. تەنانـەت مەزهـەبیش ئەبوایـە واز لـە سووکایەتی پـێکـردن بـە شتومەکە مادییەکان بێنێت و حەیسییەت و ئـابڕووی مادیـات و نەفسانیات بگێڕێتـەوە بۆیـان. هـەروەها لـەو بـاوەڕەدابوو کـە بەمەسـتی خێراترکردنـی پێشـکەوتنی کۆمـەڵگا ئـەبێ مـافی مـیرات (ارث) ڕەت، یـان بەرتەسـك بکرێتـەوەو سەرفالی ئـەوەبین کـە "بۆ هـەر کەسـێك هێنـدەی لیاقـەتی و، بۆهەر لیاقەتێك هێندەی کاریگەر بوونی".

لەم ڕووەوە، سنت سیمۆن بناغەدانـەری ڕاسـتەقینەی سۆسیالیزمە، بـەڵام سۆسـیالیزمێکی دیکتـاتۆری و ڕۆحـانی و، لایـەنگری کۆمەڵـگایەکیشە کـە ئەریستۆکراسـییەکی پێـك هـاتوو لـە، تەکنسـیەنەکان، دەوڵەمەنـدەکان و کارخانەدارەکان بەڕێوەی بەرن.

ئەندێشەکانی سنت سیمۆن بەهۆی کاریگەرییـەك کـە لەسـەر پێڕەوانیـدا هـەیانبوو، یـەکجار بـە کەڵـك بـوون و لایـەنگرەکانی، لەسـەرتادا جـۆرە ڕێکخراوێکی مەزهەبی یەکجار چالاکیان پێك هێنـا، بەڵام پۆلیس بـڵاوەی پێکردن. لەبەر ئەوە، سنت سیمۆنییەکان وازیان لەو جۆرە چالاکیانە هێنـاو زۆربـەیان، بـە پێـیڕەوراکـانی مامۆسـتاکەیان، بەسـەرکەوتنێکی زۆرەوە، لەڕێکخراوە ئابوورییەکانی ئەو سەردەمەدا بەشدارییان کـرد. یەکێك لەوانـە، بـوو بـە یـەکێك لـە دامەزرێنـەرانی هێڵی ئاسنی فەرەنسـە و ئـەوی تریـان، بـانکی ڕەهـنی فەرەنسـەو کۆمپانیـای دەریـاوانی ئۆقیانووسـی ئەتڵەسـی دامەزراند.

## فۆریە (1772-1837ز)

لایەنی تایبەتی سیکۆلۆژی کۆمەڵایەتی ئەم هزرمەندە نوخبەیە ئەومیە کە لەسەر بنەمای غەریزەکان و نەفسانیات پێك هاتووە (هەر چەند زۆرشتی زیادە و ناپێویست و بێ کەڵکیشی تێدایە). بیستنی ئەم وشانەی دوایییە لە دەم رۆمانتیکەکانەوە تەمومزو تاریکی و ماناگەلێکی خەماویمان دەهێننەوەیاد، بەڵام جۆری بیرکردنەوەی "فۆریە"، تەواو پێچەوانەیە. بەبڕوای ئەو، ئەبێ ئەو نەفسانیاتەی کە هاندەری مرۆڤن، دەس نیشان بکرێن و لێکۆڵینەوەیان لە سەربکرێت و لە رێگەی قەناعەت پێ کردنیانەوە هێوربکرێنەوە. هەروەها فۆریە چەشنی سوونەتە ئەفلاتوونییەکان، ئێوان ئیحساساتی ئینسان و سیستمی کۆمەڵایەتی، پێوەندییەکی نزیکی لۆژیکی بەدی ئەکات.

ئەو، لەو باوەڕەدایە کە ئەگەر رێکخراوگەلێکی تازەی کۆمەڵایەتی بێنە ئاراوە کە واز لە توندوتیژی کردن و دژایەتی کردنی سروشتی مرۆڤ بێنن ــ وەك تا ئەمڕۆ باوبووە ـ خۆی لە خۆیدا، مرۆڤ خۆشبەخت ئەکەن. بە ڕای ئەو، شۆڕش، ئەك تەنهادەبێ ئابووری و سیاسی بێت بەڵکوو دەبێ ئازادی ئاکاریش بێنێتە ئاراوە و لەراستیدا، ئەو بارودۆخەی کە لە ئارادایە بگۆڕێت.

فۆریەش وەك ئەفلاتوون، جۆرە سیستمێکی کۆمەڵایەتی دەخاتە ڕوو، کە بەڕای خۆی تەواو رێکوپێك و هاوسەنگەو، سروشتی مرۆڤ بە هەموو بەهرەکانیەوە، ئەتوانێت بە باشترین شێوە تیایدا بگەشێتەوەو چالاکی بنوێنێت. ئەم سیستمە بریتییە لە گرووپێکی بچووك کە پێکهاتووە لە چەند کەسێکی "بەرهەم هێنەر" کە لە هەمان کاتدا، تایبەتمەندییەکانی گوندو خێڵەسەرەتاییەکان و هەروەها ژیانی کۆشك نشینی و "مانۆفاکتۆر"یشی هەیە. بە بڕوای ئەو، لەناو گرووپێکی لەوجۆرەدا، کە ژمارەیەکی یەکجار کەمی تاکەکان لە قەڵەمڕەوێکی دڵخوازدا دەژین و بەدابەش کردنی رێکوپێکی "کار"، خەریکی جێبەجێکردنی ئەرکە

جۆراوجۆرەکانن و لە هەمان کاتدا هەم بەرهەم هێنەرن و هەم مەسرەف کەر، بەدڵنیاییەوە خۆشبەختی ئەگاتە ئەو پەڕی خۆی

هەربەو شێوە کە فۆریە، لەهەندێ رووەوە، بەیەکێك لە پێشەنگەکانی "سیکاناليز" لە قەڵەم ئەدرێت، سەبارەت بە رێکخراوەکانی کاریش دیدگاگەلێکی تازەی هەیە. بەڕای ئەو، مرۆڤ لە هەموو بوارێکدا خاوەن ئەرزش و بەهرەو سەلیقەگەلی جۆراوجۆرە. کەواتە پێویستە مرۆڤ لە دیاردەی "یەکرەوتی کار" کە رەنج و ئازار و سەرکێشی لێئەکەوێتەوە رزگار بکرێت و "کار"یش بۆ ئەوەی کە ببێتە شتێکی دڵخواز و سەرنجڕاکێش، دەبێ بگۆڕدرێت بەجۆرە سەرگەرمییەك.

بەم جۆرە فۆریە، ئەوە دەسەلمێنێت کە دابەش کردنی دروست و هەمە لایەنەی "کار"، ناکامگەلێکی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە؛ واتە ڕەنگە بە هۆی رێکخراوگەلی پێوەندیدارەوە وەك هۆکارێك بێت بۆ بە ئەزان هێشتنەوەی مرۆڤ یان پێچەوانەکەی. ئەو هەروەها رەخنە لە رەوشی زۆرە ملانەی راهێنان دەگرێت و بە هوی کەڵك وەرگرتن لە میتۆدگەلی مۆدێرنی راهێنان، کە بایەخی یەگجار زۆر بە سەربەستی و ئازادی فکری منداڵان ئەدەن، زیاتر لە رۆسۆ چالاکی نواندووەو بە تایبەت دەتوانین بە داهێنەری راستەقینەی "پێشەنگایەتی" لە قەڵەمی بدەین. ئەو داکۆکی لە ئازادی هەمەلایەنەی پێوەندییە سێکسییەکانی جنسییەکانی کردووە و بەمەرجی سەرەکی خۆشبەختی و بە تایبەت وەك چارەسەری "خەمۆکی" لەپێنووسی ئەدا.

لە لایەکی ترەوە، فۆریە لایەنگری "تەقدیر" بوو. بە ڕای ئەو، هەموو ئەو ویستانەی کە خوا لە هەناوی ئینساندا دایناوە، بە مەرجێك کە بتوانێت کەڵکیان لێوەربگرێت، باش و بەکەڵکن.

فۆریە، لە پێشەنگە جنیەکانی ئازادی ژنانیش بوو. ئەویش وەك "ئاگۆست کۆنت" لەو باوەڕە دابوو کە شۆڕشی راستەقینەی ئاکاری ، تەنها

لە کاتێکدا ڕوودەدات کە بارودۆخی ئاسایی و کۆنی ژیانی ژنان لە هەموو ڕوویەکەوە بگۆڕدرێت.

لەم بارەوە دەڵێ: "ئەگەر خەڵکانی نیمەوەحشی بەرانبەر ژنان توندوتیژی دەنوێنن و بۆ ئەوەی کە بەویستی خۆیان لە بازاڕدا بیانفرۆشن و بیانخەنە حەرەمسەراوە، وایان پێ تەڵقین دەکەن کە هیچ ڕۆح و ژیانێکیان نییە. بەهەمان شێوە ، گەلە شارستانییەکانیش بۆ ئەوەی کە لەگەڵ بیروڕا فەلسەفییەکانی خۆیان ڕێکیان بخەن و بۆ کۆیلەتی و ئیزدواج و... ڕایان بهێنن، هەر لە منالییەوە لە ئەزانیدا دەیانهێڵنەوەو دەست ئەکەن بە کوشتنی ڕۆحیان".

## پرۆدهۆن (1809-1865ز)

ئەندیشەکانی پرۆدهۆن سەرەڕای بیروڕا گەشبینانەکانی، بە تەواوەتی لەگەڵ ئەندیشەکانی فۆریەدا جیاوازییان هەیە. فۆریە بەتوندی هێرش ئەکاتە سەربناغەی ئاکاری "ئەزمی کۆمەڵگا " چوونکە بە بڕوای ئەو، شتێکی کۆن و قەدیمی و بێ بایەخە. لە کاتێکدا پرۆدهۆن داکۆکی لە ئاکاری باو و ئاسایی و تەنانەت دیکتاتۆرانەش ئەکات و ڕێزێکی زۆر قایلە بۆ پرەنسیپەکانی ئاکاری بۆرژوازی وەك؛ ئیزدواج و بنەماڵە بە پێی دەسەڵاتیهەمەلایەنەی باوك. ئەو، خسڵەتە مەزهەبییەکانی خۆی پاراستووە و وەك دۆمەستێر، تەنانەت ستایشی "جەنگ"یشی دەکرد و ڕۆڵێکی ئیلاهی بۆ قایل بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوکەری (مکمّل) جوامێری و لایەنە چاکەکانی پیاوانی لە قەڵەم دەدا.

ئەتوانین لە هەندێ ڕووەوە، پرۆدهۆن (نێمە لێرەدا، لێکۆڵینەوە لەسەر تیۆرە ئابوورییەکانی ناکەین) لەڕیزی ئەیارانی شۆڕشی فەرەنسە، دابنێین. ئەو، دژی دەوڵەت بوو و فیدراڵیزمی پێکهاتوو لەو "یەکە" بچووکانەی کە تارادەیەك ئۆتۆنۆم بوون و تاکە ژێردەستەکانیان لە ڕووی ئاکارییەوە، بە شێوەی ڕاستەوخۆ کۆنتڕۆڵ ئەکرد، بە باشتر ئەزانی. هەروەها پرەنسیپی "ئەتەوە"ی ڕەت دەکردەوە چوونکە زۆربەی شەڕەکانی سەدەی نۆزدەهەم،

بە هۆی ئەو دیاردەیەوە هاتبوونە ئاراوە و پێشبینی دەکرد کە دامەزراندنی ئیمپراتۆرییە گەورەکان، بە پێی ویستە سیاسییەکانی ئەورووپا، نەتەنها نابنە هۆی پاراستنی ئاشتی، بەڵکوو بەرێزەی چەقێتی هێزەکانی ئەو ئیمپراتۆرییانەوە ئەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕگەلێکی گەورەتر و خوێناوی تر.

## بەشی یەکەم

# سیستمە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵناسی

### ئاگۆست کۆنت (1798-1857ز)

ئەم کەسایەتییە، بەگشتی وەك دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژی مۆدێرن، کە تەنانەت ناوەکەشی داهێناوە، لە قەڵەم ئەدرێت[48]. لەبەر ئەوەی کە سکرتێری (مونشی) سنت سیمۆن بوو، هەر بەم هۆیەوە هۆگرییەکی زۆری بەرانبەر سوننەتگەلی ئەنسکلۆپیدیکی سەدەی هەژدەهەم هەبوو. هەروەها لە ژێر کاریگەرێتی رشتەنەکانی والتەر لە دژی متافیزیکدا بوو و بۆبەرەنگاری کردنی تیۆلۆژی و تیۆرامانە فەلسەفییەکان ، سۆسیۆلۆژی هەڵبژارد (کە بە ڕای ئەو، جگە لە زمانبازییەکی ئاسایی و زێدەڕەوانە زیاتر بە هیچ شتێکی تر لە قەڵەم نەئەدرا). وەك چۆن دیکارت، پاشماوەی پێوەندییەکانی نێوان فەلسەفە و تیۆلۆژی لە ناوبرد، "کۆنستە"یش سۆسیۆلۆژی لە متافیزیك جیا کردەوەو لە کۆنت بەدواوە، "بایەخ نەدان بەمتافیزیك"، بوو بە لایەنی تایبەتی سۆسیۆلۆژی. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار متافیزیك، یان تەنانەت تیۆلۆژیش بە شێوەی ــ کەم تازۆر ــ نهێنی، هەوڵیان داوە کە سۆسیۆلۆژی بخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە.

سیستمی کۆنت، بەپێرستێك لە زانستەکانی مرۆڤ و، تیۆرییەکی گشتی سەبارەت بە "زانست" دەست پێ ئەکات. ئەو، زانست بەشەش بەش دابەش ئەکات و بەم جۆرە پۆلێنیان دەکات: بیرکاری، "هەیئەت"، فیزیك، کیمیا، بایۆلۆژی و لە سەرووی هەمووشیانەوە زانستی تازەی سۆسیۆلۆژی، یان راڤەکردنی عەینی و پۆزەتیڤی کۆمەڵگاکان. بە وتەی کۆنت، ئەم پۆلێن

کردنە نەك تەنها لەسەر بناغەیەکی راسیۆنالْ راوەستاوە، بەڵکوو لەگەڵ مێژووی زانستیشدا دێتەوە. چوونکە ئەو زانستانەی کە بابەتەکانیان ئاسانترە، پێشتر هاتوونەتە ئاراوە، وەك لەو زانستانەی کە بابەتگەلێکی ئاڵۆزتریان هەیە.

سۆسیۆلۆژی، زانستێکە کە راڤەی هەندێ بابەتی دەسنیشان کراو دەکا و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانیش بەهەموو لایەنەکانیانەوە ئەخاتە بەر راڤە و لێکۆڵینەوەوە. بە بیروڕای کونت، کۆمەڵگا پێکهاتەیەکە لەو کەسانەی کە لە ڕاستیدا درێژەی هەمان ژیانی ئینسانانی پێش خۆیانن و لە مێشك و زەینیاندا چەقیان داکوتاوە. بە کورتی، کۆمەڵگا پێکهاتەیەکە لە کەڵەکەبوونی ئەو ئەزموون و زانستانەی کە وەچەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. بەڵام کۆمەڵگا، لە هەموو بوونەوەران بگۆڕترە، چوونکە دەتوانێت خۆی لەگەڵ هەموو جۆرە دیاردەیەکی دەرەکی بگونجێنێت. هیچ بوونەوەرێك، توانای ئەو جۆرە پێشکەوتنە خێرا و بە تایبەت بەردەوامەی نییە، چوونکە بە هۆی دوابەدوای یەك هاتنی وەچەکانەوە،کۆمەڵگا بەسەر زەمەندا زاڵە.

بە بیروڕای کۆنت، رەوشی سۆسیۆلۆژیستەکان، هەمیشە دەبێ لەسەر تێڕامان و ئیستدلالەوە ڕابوەستێت. کۆنت ئەم تیۆرەی پەیوەست ئەکرد بەو تیۆرە گشتییەی خۆیەوە کە سەبارەت بە گۆڕانکارییە فەلسەفییەکان بوو. بە پێی ئەوتیۆرەی ئاوبراو، کە بەناوی "یاساکانی قۆناغە سێ[49]" ناسراوە، مرۆڤ لەدرێژەی هەوڵ و تەقەلا بەردەوامەکانیدا، بە مەبەستی تێگەیشتن و ئیستدلالی کێشەکانی جیهان و ژینگەکەی خۆی، سێ قۆناغی دوابەدوایەکی تێپەڕاندووە:

**1ـ قۆناغی تیۆلۆژی:**

کە بریتییە لەوەی کە هۆکارە سەرەتاییەکان و بەگشتی خواکان، بە هۆکاری ڕووداوە جۆراوجۆرەکان لە قەڵەم بدرێن. گرووپە رۆحانییەکان لە

ناو ڕێکخراوگەلی لەباری کۆمەڵایەتیدا، بە هۆی ئەو جۆرە بیرکردنەوەوە، دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەیان هەیە.

## 2ـ بازداني متافيزيك:

لەم قۆناغەدا مرۆڤ هەوڵ ئەدات پشت بە بەڵگەگەلێکەوە ببەستێت کـە جیاوازییـان لەگـەڵ کۆمەڵـگا و ڕێکخـراوە ئینسـانییەکاندا هەیـە.هۆکـارە گشـتییەکانی تـر، واتـە، یەکـە متافیزیکیـەکان سـەقام دەگـرن ولـەژیانی نەتەوەکانـدا دۆگماتیزمێـك سـەرهەڵ ئـەدات کـە لەسەرووی هەموو واقعییەتەکانە و هەروەها دەبێتـە پاشکۆی هەنـدێ پرەنسـیپی نائـەزموونی وەك؛ ئایـدیای ئـازادی ڕەهـا و فەزیلـەتی نەگۆڕو ....هتد.

## 3ـ قۆناغي پۆزيتيويسم:

کە بە پشت بەستن بە تێڕامان و لێکۆڵینەوەی زانستیانەوە؛ بە ئەزموون و کردەوە، لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکاری دیاردەکان دەکات.

دەبـێ تـەنها ڕەوشـی فەلسـەفەی پۆزیتیویسـم[51]، ڕێککـەوتن لەگـەڵ ڕاستییەکاندابێت. ئەم فەلسەفە، ئەبێ لە "ئامپیریزم" و تەسـەوفیش خۆی بپارێزێت و لێکۆڵینەوە لەسەر یاساگەلی دیاردەکـان بکات. واتـە، پێوەندییـە هەتاییـەکانی نێـوان ئەودیاردانـەی کـە لەبەرچاو ئـەگیردرێن. ئەگـەر ئـەم دیاردانە، بەکۆمەڵ یا هێندی هێندی لێکۆڵینەومیان لەسەر بکرێـت و بـە هـۆی وێکچوون، یان پۆلێن کردنەوە بە یەکەوە ببەسـترێنەوە، بـە هـیچ شێوەیەك نابێـت هۆکـارە ڕەهاکـان، یـان جەوهـەری شـتومەکەکان لێـك بدرێتـەوە. چـوونکە فەلسـەفەی پۆزیتیویسـت ئەوەیـە کـە هەمیشـە جـەخت لەسـەر "نسبییەت" دەکات، وەك لە "ڕەهابوون".

لە ئاکامدا، بـەبیروڕای کۆنـت، سیکۆلۆژی دەبـێ کۆتـایی بـەبوونی خـۆی بهێنێت و لە نێوان بایۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیدا دابـەش بکرێـت. چـوونکە بـە قسـەی ئـەو، تـاك، ئەبسـتراکتێکی سکوولاستیکەو تـەنها کـۆی مـرۆڤ ئـەمری واقیعە.

وەك چۆن لە فیزیا یان کیمیادا، هێزەکان، سەرەتا بە شێوەی وەستان و هاوسەنگی (رکود و تعادل) و پاشان لە حاڵەتی چالاکی و جووڵانەوەدا تاقی دەکرێنەوە، سۆسیۆلۆژیش نەبێ بریتی لە دووبەشی بنەڕەتی بێت:

1ــ بەشی هاوسەنگی، کە بارودۆخی سەقامگرتووی ژیانی کۆمەڵگاکان بخاتە بەر لێکۆڵینەوە.

2ــ بەشی دینامیك، کە لێکۆڵینەوە لە سەر یاساکانی کامڵبوونی کۆمەڵگا بکات. ئاگۆست کۆنت بە درێژە پێدانی سوننەتە گەش بینانەکانی "کۆندرسە" و "سنت سیمۆن" دان بەوەدا نەنێت کە گۆڕان، دەبێتە هۆی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ریزی ئەو هزرمەندانەدایە کە ئاژاوە گێڕییەکانی شۆڕشی فەرەنسەیان بەناڕەوا و نادروست زانیوە و ویستوویانە رێگە لەسەرهەڵدانی شۆڕشی گەورەی لەو جۆرە لە ئاییندەدا بگرن. بە قسەی کۆنت، بایەخی پراکتیکی سۆسیۆلۆژی ئەوەیە کە لە حاڵەتی هاوسەنگی کۆمەڵگەدا بارودۆخی نەزمی کۆمەڵایەتی و، لە حاڵەتی دینامیکدا، یاساکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بدۆزێتەوەو دەس نیشانیان بکات. بەڕای ئەو، دەتوانرێ شان بە شانی "نەزم"یش پێشکەوتنی بەردەوامی مرۆڤایەتی مسۆگەر بکرێت. کەواتە، "نەزم و پێشکەوتن" دروشمی سیاسەتی پۆزیتیویزمە.

ئاگۆست کۆنت، لە کۆتایی تەمەنیدا دەرکی بەوەکرد کە ئەرکی سەرشانیەتی، بە بێچاوەڕوان کردنی کۆتایی هاتن و کامڵبوونی زانستی کۆمەڵگا، رێکخراوێکی ئایدیالی کۆمەڵایەتی پێشنیار بکات. پاشان بە هۆی وەرەز بوونێکی لەڕادەبەدەرەوە، تەنانەت گومانیشی لە میتۆدە تایبەتییەکانی خۆی کردو وتی: "ئەمڕۆ بوێرانە دەتوانم بڵێم کە مێشکی لاوازی ئێمە هەرگیز ناتوانێت زانستەتەواو مادییەکان دەرك بکات".

بە بیروڕای کۆنت، تەنها رێگەی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا، ئەوینێکی گشتی و جیهانی و یەکجار بەهێزە کە تاکەکان بەرەو لای یەکتری رابکێشێت و لە پلەی یەکەمدا، ئەبێ مرۆڤ ببێتە ئامانجی ئەم ئەوینە.

بەڵام سەرەڕای ئەوە کە فەیلەسووفانی سەدەی هەژدەهەم، بە هۆی ئەم ئیستدلالانەوە بەسیاسەتێکی لیبراڵی ئەگەیشتن، بەڵام ئاگۆست کۆنت ئەیەویست ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی لەبری کەسایەیەتییەکی دەسەڵاتدارو ڕێبەر دابنرێت و دەسەڵاتی ناوەندی، کاریگەری لەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دابنێت. کۆنت تەنانەت بە توندی دژایەتی ئازادی فکری ئەکرد، چوونکە پێیوابوو "لە ناو ماتماتیکدا ئازادی ئیرادە بوونی نییە". ئەو، کە لە بەینەزمیییەکانی هەڵقولاوی شۆڕشی 1848 بە تەواوەتی وەڕەزبوو بوو، پێشوازی لە کوودەتای ناپلیۆنی سێهەم کرد.

ئاگۆست، لە کۆتایی ژیانیدا بڕیاری دا بە باشترین شێوە، چۆنیەتی حکوومەتە ئایدیالەکەی خۆی وەسف بکات: ئەو دەیەویست مەزهەبێك بێنێتە ئاراوە و مرۆڤ پەرەستی ـ کە خۆی بە "بوونەوەری گەورە" ناودێری ئەکرد ـ بکاتە بناغەی ئەو مەزهەبە. هەر بۆیە هەوڵی دا کەڵك لە هەموو ڕێوڕەسمە باوە ئایینییەکان و هەروەها کەڵك لە دامەزرێنەران و گەورەپیاوان و کاروبارەکانیان وەربگرێت و لەو مەزهەبەدا کۆیان بکاتەوە. بە هۆی ئەم مەزهەبەوە، لیژنەیەکی ڕۆحانی کە بە هۆی دەسەڵاتێکی باڵاو، لە هەمان حاڵیشدا مەزهەبی و زانستی و سیاسییەوە، ئەندامەکانی خۆی هەڵئەبژێرێت، دەبێ چارەنووسی مرۆڤیش هیدایەت بکات. ئێمە لێرەدا بۆ جارێکیتر، ئایدیالی ئەفلاتوون و فیساغوورس، واتە؛ کۆمەڵگایەکی تیۆکراتیك کە کۆمەڵێکی عاقڵ و زانا بەڕێوەی ئەبەن، بەدی ئەکەین . بەڵام کۆنت، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە نەك تەنها پیاوان، بەڵکوو ژنانیش ئەبێ لەم دەزگا باڵا ڕۆحانییەدا بەشداری بکەن و، وەك "دایك و ئیلهام بەخش" ڕێزێکی زۆریان لێبگیردرێت.

بەم جۆرە ئاگۆست کۆنت، سەرەنجام دەستی کرد بەگەڕان بەدوای ئەو زنجیرە پلەوپایەگەلەی کە باس و لێکۆڵینەوە هەڵناگرن و دەتوانین بڵێین کە بەمجۆرە دەیەویست، زنجیرە پلەوپایە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بناغەی ئایین دابمەزرێنێت. زۆربەی خوێنەکارانی کۆنت، وەك "لیترە"، بە

تـەواوەتی ئـەم بەشـە نۆرماتیڤـەی فەلسـەفەی کۆنتیـان خسـتە لاوە. بـەڵام هەندێکیان بـە پێچەوانەوە بـەو پـەڕی لۆژیکی بـوونی فەلسـەفەی کۆنـت و هـەروەها بەڵـگەیەك بـۆ نازایـەتی کۆنتیـان لـە قەڵـەم ئـەدا. چـوونکە بـە بیروڕای ئەوان، کۆنت تەنها پشتیبە رەخنـەگرتن و لێکۆڵینەوەگەلی سـادەی فەلسەفی نەبەستووە بەڵکوو، بـیری لـەوە کردبـوەوە کـە لەگەڵ واقعییـەت دا ڕووبەڕوو ببێتەوەو ناسەوارێکی بەکەڵك و پراکتیکی بهێنێتە ئاراوە.

## ئستوارت میل (1806-1873ز) و یوتیلیتاریزم

بەهۆی بیروڕاکانی ئستوارت میلەوە، لیبرالیزم ئەولایەنە سیکۆلۆژیکییەی کە پێشتر لە سەدەی هەژدەهەمدا هەیبوو، سەرلەنوێ بەدەستی هێنایەوە. تا ئەو سەردەمە، هەندێ ڕووداوی تازەی جۆرلەجۆر ڕوویـدابوو، وەك، شۆڕشـی پیشەسـازی، هـەژاری چـینی کرێکـار، زیـاد بـوونی لەڕادەبـەدەری جـەماوەر، ئیمپریـالیزم و فرەخـوازی وتـەماحی ئیسـتعماری و ئـابووری، کۆبوونـەوەی هێدی هێدی کریکارن لـە نـاو سـەندیکاکان و... ئـەو ڕووداوە تازانـە، بوونـە هۆی ئـەوەی کـە زۆربـەی هزرمەنـدان، لـە جیـاتی بیرکردنـەوە و تـێڕامـان؛ زیاتر خەریکی کاری کردەیی (عملی) بـبن. هەنـدێکیان کـە لـە داخوازەکـانی خەڵکی ترسابوون، بەدوای ڕێکخراوێکی لەباری کۆمەڵایەتیدا بـوون، تـا لـەو ڕێگەیەوە خەڵك سەرکوت بکەن. هەنـدێکیتـر، وەك "بلانکـە" و "سـوورل" تەنها ڕێگەچـارەیان لـەوەدا دەبـینی کـە چـینە هـەژارەکان وەك ڕێکخراوێکـی نیمـە سـەربازییان لـێ بێـت و نـارەزایی خۆیـان دەربـبڕن. ئـەم دوو ڕوانگـە دژبەیەکە، بیروڕاکانی ئەو مێژوونووسـانە ئەهێنێتـەوە یـاد کـەپێیـان وابـوو مێژووی مرۆڤ هەڵقوڵاوی زنجیرە تاقیکاریگەلی هێزە جۆراوجۆرەکانە.

ئستوارت میل، ئازادی بیرکردنەوە لەسەرووی هەمووشتێکەوە دادەناو لەو باوەڕەدا بـوو کـە ئـەم ئازادییـە، ئاڕادەیـەك بـەناسـانی هـەموو کێشـەکانیتـر چارەسەرئەکات. ئەویش وەك "فۆریـە" خوازیـاری ئازادییـەکی هەمەلایەنـە بوو، چوونکە پێیوابوو "لەناو بردنـی جـەبرو ئـازاری جەسـتەیی، بـە تـەنها بەس نییە، چوونکە زۆربـەی کـات لـە کۆتـوبەنـد کردنـی بـیروڕای گشتی و

کۆنترۆڵ کردنی ئاکار، لە رووی رۆحییەوە، ئینسان بە کۆیلە ئەکات". لە ئینسانیشدا، هاورەنگ بوون و پەیڕەوی کردن، وەك هێزێکی ئاکاری، کەمتر و لاوازترە لە هێزی جەستەیی. **تەنها رێگەی خۆپاراستن لە مەترسی وەستان و دارمانی فکری‌ئازادییە، بە تایبەت ئازادی دەربڕینی بیروڕاگەلی تازە، چوونکە "تەنها سەرچاوەی پێشکەوتنی بەردەوامە و هەرگیز کۆتایی نایەت. هەروەها هێندەی ژمارەی کەسایەتییەکان، ناوەندگەلی سەربەخۆی ریفۆرمخواز دائەمەزرێنێت**[51]". کەواتە بە هۆی جووڵانەوەی ــ زۆربەی کات پێشبینی نەکراوی ــ تاکەکانەوەیە کە کۆمەڵگا، فۆرمێکی تازە لەخۆ دەگرێت و بە تەواوەتی رژێمەکەی ئەگۆڕێت.

ئستوارت میل، سەرەڕای بایەخ دانی زۆریش بە پۆزیتیویزم و ئاگۆست کۆنت، تێگەیشتنە نۆرماتیفەکانی پشت گوێ خست و هیچ بایەخێکیش بۆ رژێمە دیکتاتۆرەکان قایل نەبوو، تەنانەت ئەگەر لە لایەن کۆمەڵێك لە بیرمەندان و زانایانیشەوە ئیدارە بکرێن. بەوتەی ئەو، بەمەبەستی پێکهێنانی گۆڕانکاری، ئێستە تەنها دوو رێکخراو لە ئارادان کە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن و پێشکەوتن لە گەڵ یەکدیدا ململانێ ئەکەن و ئەوانەش بریتین لە دیمۆکراسی و بوروکراسی. تەنها رێگەیەك کەلەبەردەمایە ئەوەیە کە، دیمۆکراسی کەڵك لە بوروکراسی وەربگرێت‌و کۆنترۆڵی بکات و هیچی تر. هەروەها ئەوەش دەڵێ کە "**دیکتاتۆرییەکی باش، لە وڵاتێکی کەم تا زۆرشارستانیدا، لە دیدگایەکی خراپیش خراپترە چوونکە هێزو دەسەڵات و توانای داهێنانی خەڵك، کز و لاوازتر ئەکات**".

ئستوارت میل هەوڵی ئەدا ئابووری لیبراڵ لەگەڵ کۆمەڵگادا ئاشت بکاتەوەو بەم دەرەنجامە دەگات کە "بڕیار دان لەم بارەوە، رەنگە گرێدرابێت بە دەسنیشان کردنی ئەو مەسەلەیەوە کە، کام یەك لەو دوو سیستمە "ئابوورییە" ئەتوانێت لەگەڵ زیاترین رادەی ئازادی و ئیختیاری مرۆڤدا سازگاربێت. چوونکە کاتێ کەهەموو کەرەسە و پێداویستییەکانی ژیان دابین کران، حەزکردن بە ئازادی، ئەبێت بە یەکێك لە بەهێزترین

پێداویستییە شەخسییەکانی مرۆڤ و لە جیاتی ئەوەی کە حەزو تاسەی بەرانبەر کامڵبوونی بەهرە فیکری و ناکارییەکان کەم بێتەوە، بە پێچەوانەوە ڕوو لە زیاد بوون ئەکات".

ئستوارت میل بۆ هەڵسەنگاندنی ئەرزشی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان بە دوای پرەنسیبگەلێکدا ئەگەڕا کە هیچ جۆرە لایەنگرییەکیان تێدا نەبێت. بە بڕوای ئەو، باشترین ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە بتوانێت زیاترین رادەی کەڵك وەرگرتن لە ئاسایشی مادی و ئازادی بۆ زیاترین ژمارەی خەڵك دابین بکات. بەڵام ئەم دیدگایە واتە "Utilitarisme" لەو سەردەمەدا، بە شتێکی ئاناکاری لە قەڵەم ئەدرا.

لە لایەکیترەوە، سەرەڕای ئەوە کە ئستوارت میل، رەخنەکانی "ریکاردۆ" و "مالتووس"ی لە دژی زێدەڕەوییەکانی دینامیزمی ئابووری و بە تایبەت ئەو دینامیزمە ڕوولەزیادبوونەی کە بە هۆی ئازادییەوە سەری هەڵدابوو، پەسەند کردبوو، بەڵام ڕێگە چارەی ئەم مەسەلەیە بەبیروڕای ئەو ــ لە جیاتی ئەوەی کەنیسان دابنیشێت و چاوەڕێی بەڵا ئاسمانییەکان بێت بەمەبەستی کوشتارو کەم بوونەوەی ژمارەی جەماوەری خەڵك ــ راهێنان، ئازادی سێکسی و لەگەڵ ئەوەشدا کەم کردنی زاوزێ بوو.

سەرەنجام ئستوارت میل کە بەردەوام بەدوای سازگارترین بارودۆخ بۆ گەشانەوەو دەرکەوتنی کەسایەتی مرۆڤ دا بوو، لە دوو ڕوانگەی ماف مەدەنی و مافی سیاسییەوە، رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە ئازادی ژناندا. بیروڕاکانی ئەو، لەم بارەوە، بە نیسبەت دروست تر و راشکاوانەتر لەوانەی ئاگۆست کۆنت بوون، چوونکە کۆنت زیاتر لە ڕووی ئیحساسییەوە لایەنگری ژنانی ئەکرد.

بە بیروڕای ئستوارت میل، پێوەندی نێوان ژنان و پیاوانی هەر گەلێك، گرنگترە لە پێوەندی لەگەڵ گەلانی بیانیدا و، مەسەلەی ئازادی ژنان،لەڕووی پێشکەوتنەکانی داهاتووی مرۆڤەوە، هێندەی مەسەلەی ڕزگار بوونی چینە هەژارەکان گرنگی هەیە.

ئەویش وەك فۆریە، لەوباوەڕەدایە كە ژنان، قوربانی پاشماوەی ئەو داب و نەریت و خورافاتە سەرەتاییانەن كە ئەمڕۆ هیچ بیانوویەك بۆ درێژە پێدانیان نەماوە.

## ماركس و ماتریالیزمی مێژوویی (1818-1883ز)

ئەندیشەكانی ماركس، تارادەیەك لە پۆزیتیویزم ئەچن. ئەویش وەك ئاگۆست كۆنت مەسەلە متافیزیكییەكانی بە تەواوەتی خستۆتە لاوە و سەرجەم هەوڵ و تەقالاكانی بۆ راقەكردنی دیاردەكانی كۆمەڵگا تەرخان كردووە. لەئاسەوارەكانی ماركسدا، سۆسیۆلۆژی بە مانا تایبەتییەكەی، تا رادەیەك رۆڵێكی پلە دوەمی هەیەو تیۆرە ئابوورییەكانی لە پلەی یەكەمدان (واتە، زیاتر گرنگایەتی بە تیۆری گەنی ئابووری داوە، كە لە چوارچێوەی ئێستای ئەم كتێبەدا ناگونجێن).

لایەنە بنەڕەتییەكانی میتۆد و سۆسیۆلۆژییەكەی كارل ماركس، بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

ماركس وەك گۆڕانە یەك لایەنەكەی هێگڵ، كەتیایدا، "تێز" بە تێ پەڕین لە "ئانتیتێز" لە دوا قۆناغ دا ئەبێ بە "سەنتز"، دەگۆڕێت بە دیاردەیەكی ئاڵۆزتر كە تیایدا، تێزو ئانتی تێز بە هات و چۆیەكی دوولایەنەو "ئیستقرایی"، كاریگەری لە سەریەكی دادەنێن. دیالكتیكی ماركسیستی، بە هیچ شێوەیەك وەك دیالكتیكی هێگڵ، جۆرە زمانبازییەكی بێ كەڵك و بێمانانییە، بەڵكوو شیكردنەوە و لێكدانەوەیەكی پۆزەتیڤە لەسەر هێزە كاریگەرەكان و بە تایبەت ئەو كاریگەرییانەی كە لەسەر یەكدی دایدەنێن.

ماركس ئەم شیكردنەوەو لێكۆڵینەوانە لە گۆشەنیگای دینامیكەوە، واتە بە مەبەستی دەرك كردنی هۆكار و چۆنیەتی گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتییەكان ئەنجام ئەدات. هەر كۆمەڵگایەك لە ناو خۆیدا هەندێ شتی دژبەیەك و هەروەها هەندێ هێزی دژبەیەكی هەیە: ئەم شتە دژبەیەكانە جۆراوجۆرن و هەندێكیان وەك "كێبەركێ ئەتەوەیی و ئاینییەكان"، دوابەدوای یەك

دنیایان غەڵتانی خوێن کردووە. بەڵام بەڕای مارکس "ململانێی چینایەتی" گرنگترینی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە، بە هەر حاڵ کۆمەڵگا، تەنانەت دێرین بێت یا خود فیۆداڵیتەش، جۆرێکە لەم ململانێیە.

مارکس، بەرانبەر ئەو کەسانەی کە ڕەخنە لە بنەڕەتی بوونی ئەم جۆرە دوژمنایەتییانە ئەگرن و پێ لە سەر ئەوە دائەگرن کەکەمتر لە دوژمنایەتییەکانی دیکە شەڕو ئاژاوە ئەخەنەوە، بەم جۆرە وەڵام ئەداتەوە کە، دژایەتییە ئەتەوەیی و ئایینییەکان، بە غافڵ کردنی خەڵك لە ململانێ چینایەتییەکان، دوژمنایەتییە ڕاستەقینەکان دەشارنەوە.

هەروەها پێوایە ململانێ ناچینایەتییەکان و هەروەها ئەو دەستڕێژییە لاوەکی و دەسکردانەی کە بۆ غافڵ کردن و ڕێ ونکردنی خەڵکی ئەنجام دەدرێن، زۆربەی کات نابەرهەست و نائیرادین. لێرەدا دەتوانین ئەوژمی ئیستدلالەکانی "شەکاکەکان"ی سەدەی هەژدەهەم بە تایبەت "واڵتەر[52]" هەست پێ بکەین. مارکس، بە توندی ڕەخنە لە بەرەو گەندەڵی بردن و غافڵ کردن و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی دەگرێت. بە بیروڕای ئەو، کۆمەڵگای سۆسیالیستی، کۆمەڵگایەك ئەبێت کە مرۆڤ تیایدا نابێ بە کۆیلەی بوتە ئینسانی، یان ئایدۆلۆژیکە باڵاکان. هەروەها مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکی لەو جۆرەدا، لە جەبری خەسارکردن و رووخاندنی کەسایەتی و هێزی کاری خۆی ڕزگاری ئەبێت. بە بیروڕای مێژوونووسێکی فەلسەفی، ئەم تیۆرە، پەرەسیی ئاکاری کردەیی کۆنت ـ واتەمرۆڤ بە گشتی ــ ئەهێنێتەوە یاد و دەس نیشانی دەکات.

دوژمنایەتییە کۆمەڵایەتییەکان، چۆن ئەگۆڕدرێن؟ بەوتەی مارکس، هاندەری سەرەکی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان،ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانەن کەخۆشیان هەڵقوڵاوی جۆری بەرهەم هێنانن. لێهاتوویی مارکس لەوەدا بوو کە بە باشترین شێوە گرنگایەتی پێوەندی نێوان شێوەکانی بەرهەمێنان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی دەستنیشان کرد. ئەم ڕێکخراوانە کە بە پێی ژینگە و کەش و هەوای تەکنیك دائەمەزرێن،

سەربەخۆ لە ئیرادەی مرۆڤن. کەواتە لەم ڕووەوە مارکس، بەتەواوەتی خاڵی بەرانبەری هیگڵە. بە بیروڕای هیگڵ، ئایدیا مێژوو ئەهێنێتە ئاراوە، بەڵام بە بیروڕای مارکس مێژوو، ـــ بە تایبەت ژێرخانی ئابووری ـــ ئایدیا ئەهێنێتە ئاراوە. هەروەها بە بیروڕای مارکس، چەمکی ئایدیا پرەنسیبێکی متافیزیکی نییە بەڵکوو بریتییە لە هەندێ تیز و پرەنسیپی سیاسی و هەروەها مافی کۆمەڵایەتی. کەواتە بە بیروڕای ئەو، هەموو شتێك لەسەر بناغەی "مادە" ڕاوەستاوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە تێزەکەی مارکس، بە ماتریالیزمی مێژوویی ناودێر کراوە. لە ناو ئەندیشەکانی مارکسدا، هەندێ لایەنی فاتالیستی(جەبری) بەدی دەکرێت:

1ـ هەزاری چینەدەسکورتەکان، بە هۆی خراپکاری و دڵ پیسی مرۆڤەوە نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵکوو بەرهەمی جۆری کارکردنی ماشینی ئابووری و ئاکامی دۆزانکارییەکی ئاثیرادییە؛

2ـ ڕەوشی تاکەکانی مرۆڤ بەستراوەتەوە بە ڕۆڵی پێوەندییان بە بزاوتە جۆراوجۆرە ئابوورییەکانەوە. ئەمە مانای "چین" دەگەیێنێت و مرۆڤی کۆیلەی ئابووریش. ئیکۆنۆمیستە کلاسیکەکان ئەهێنێتەوە یاد کە ئەویش بە جۆرە جەبرێکی سادەی ئابوورییەوە بەسترابووەوە.

3ـ مارکس پێشبینی دەکات کە لە ئاکامی پێشکەوتنی تەکنیك و گۆڕانکاری ئابووری دا؛ بە تایبەت بە ناوەندبوونی کارخانە پیشەسازییەکانی دەزگا ئابوورییەکەی ئێستا کە لەسەر بناغەی قازانج (کاپیتالیزم) ڕاوەستاوە، سەرەنجام هەڵئەوەشێتەوە؛

4ـ هەر بەو شێوەی کە ئاگۆست کۆنت، پۆزیتیویزم بە لووتکەی ئەندیشەکانی خۆی لە قەڵەم ئەدات، "مارکس"یش دوای پیشاندانی ئەوە کە هەموو شێوەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەندێ دوژمنایەتی تایبەت بە خۆی دەخوڵقێنێت، سەبارەت بە دوژمنایەتییەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایەی کە خۆی پێشبینی ئەکات و هەروەها سەبارەت بە شێوە تازەکانی زنجیرە پلەو پایە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کومەڵگایە هیچ قسەیەك ناکات. لێرەشدا، ئەم

لایەنە سەرنج ڕاکێش و هاوبەشەی زۆربەی تیزە گەورەکانی سۆسیۆلۆژی نۆرماتیڤ، کە هەموویان هەوڵی دامەزراندنی دەزگایەکی سەقامگیر ئەدەن، بەدی دەکرێت.

شان بەشانی ئەم گەشبینییە، خواستێکی ئیرادی و شۆڕشگێڕانەش لە ناو ئەندیشەکانی مارکس دا دەبینرێت. بە ڕای ئەو، کاتێ کە مرۆڤ بزاڤە ئابوورییەکان دەرك بکات و بتوانێت لێکیان بداتەوە، دەتوانێت بە شێوەیەکی کاریگەر دەستیان تێوەر بدات و ڕەوتەکانیان بگۆڕێت و ئەمەش کاتێکی لەبارە بۆ "بە گەڕخستنی ئیرادە" و دەست پێکردنی "هۆکاری سۆبژێکتیڤ" لە کۆمەڵگەدا. لەگەڵ ئەوەشدا مارکس ئەگەری شکست هێنانی ئەم هۆکارەش لەبەرچاو دەگرێت. هەڵبەتە لەو حاڵەتە دواییەدا، هیچ ڕووداوێك ناقەومێت، یان تەنانەت ڕەنگە ڕوو لە "ئاوابوون" بکات. دیارە لە درێژەی ڕەوتی خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخی تازەدا، خۆپاراستن لە ئاژاوە تازەکانیش ئاسان نییە و بگرە زۆر سەختیشە. بە تایبەت، چوونکە چینە دەسەڵاتدارەکان، لەم ڕووەوە کە پلەوپایەو پیشەی خۆیان لە دەست داوە، مقاومەت ئەکەن.

ئەم لایەنە تایبەتانە ـــ کە هەڵقوڵاوی گەشەسەندنی ئاسەوارەکانی مارکس و هەروەها درێژخایەن بوونی ماوەی گۆڕانکارییە فکرییەکانی ئەون ـ هەندێ قوتابخانەو حیزبی سیاسی هێناوەتە ئاراوە کە هەموویان خۆیان بە لایەنگری ئەو دەزانن. هەندێ کەسی وەك "برۆنشتین" و "ژۆرس"، هەروەها تیۆرسیەنەکانی بزاڤە سۆسیال دیموکراتەکان، هەندێ داگەڕانی هێمنایەتیخواز و گەش بینانەیان هەیەو لایەنگری ئازادی تاکەکەسین و، خوێنەرەکانی تری مارکسیش نوێنەری خواستە شۆڕشگێڕانە و لێبڕاوانەکانی مارکسن ـ بە تایبەت ئاسەوارەکانی لێنین و تیۆرسیەنەکانی دیکەی بزاڤی کۆمۆنیستی، نموونەیەکی تەواوی ئەو مەسەلەیەن. لێکدانەوەی ئەم تێزانە کە لە بنەڕەتدا، سیاسین و هەندێ ئامانجی خێراو پراکتیکییان هەیە، لە بازنەی سۆسیۆلۆژی زانستیدا ناگونجێن.

بە هەرحاڵ دەتوانین بەراشکاوییەوە ئەوە بڵێین کە دوای سەنت ئاگۆستین، هیچ تیزێکی سۆسیۆلۆژی، لە بواری پراکتیکییەوە هێندەی تیزەکەی مارکس سەرکەوتوو نەبوە. ئەم تیزە ئەمڕۆ بە شێوەیەکی رەسمی و راستەوخۆ ئیلهام بەخشی گرنگترین بزاڤگەلی سیاسی هاوچەرخە (هەنووکە، لە "کیشوەری کۆن"دا رەگەزی سپی، لە نێوان دوو داگەرانی دیاریکراودا، تا رادەیەك بە دوو بەشی یەکسان دابەشکراوە). ئایدیاکانی مارکس، بە دوو فۆرمی دیکتاتۆری و لیبراڵەوە، بە شێوەیەکی رەسمی، رێکخراوەکانی چەندین دەوڵەتی گەورە رێبەرایەتی دەکەن. رووداوە تازەکانیش ئەوە دەرنەخەن کە فەلسەفەی مارکسیستی، شۆڕشێکی گەورە رێبەرایەتی ئەکات کە ئاژاوە و شڵەژاوێتی رێکخراوە کۆمەڵایەتییە دێرینەکان و جۆری بیرکردنەوەی کۆنی هەندێ لەگەلانی ئاسیایی ئەو مەسەلەیە دەسەلمێنن بە تایبەت، ئەمڕۆکە پێدەچێت جیهانبینی تایبەتی چینی، بە تایبەت لۆژیکی "تائۆ[53]" و فەلسەفەی کۆنفسیۆس، بە فازانجی مارکس پشت گوێ دەخرێت.

## هێربێرت سپێنسر و ئۆلۆسیۆنیزم (1820-1903ز)

ئەویش وەك ئاگۆست کۆنت سۆسیۆلۆژی لەسەرووی هەموو زانستەکانەوە دادەنا. سۆسیۆلۆژی سپێنسر، سۆسیۆلوژییەکی تەرکیبی و ئەنسکلۆپیدیکە، بەڵام ئەو لە راستیدا دەیەویست پرەنسیپی گۆڕانکاری، کە لەو سەردەمەدا پاش "لامارك" و "داروین"، سازگارییەکی یەکجار زۆری لەگەڵ فەلسەفەدا هەبوو، لە هەموو بوارەکاندا بخاتە گەڕ. ئەویش وەك کۆنت پێی وا بوو کە هەموو شێوەکانی ژیان، درێژەی هەمان شێوەکانی پێشترن و لە هەمان کاتیشدا دەس پێکەری شێوەیەکی تازەن.

لەم رووەوە، پاسای ئەو گۆڕانکارییەی کە سپێنسر دایەنێت، بریتییە لە گۆڕانی هێندی هێندی کۆمەڵێکی یەکڕەوت (یکنواخت)، بە کۆمەڵێکی فرەچەشن. واتە لە هەموو بوارەکاندا رەوتێکی "سەرهەڵدانی جیاوازی" لە ئارادایە.

گرووپگەلی ئینسانی لە کۆمەڵگەدا، سەرەتا وەك دەستەگەلێکن کە هەموو ئەندامانی لە رووی فکری و تەکنیکی و ئابوورییەوە یەکسانن، پاشان دەبنە کۆمەڵانێکی ئاڵۆز، کە تیایاندا دابەش کردنی کارو پێوەندییە فەزاییەکانی نێوان تاکەکان، روو لە جیاوازی و ناتەبایی دەکەن.

کۆنت، بە هۆی باوەڕمەندی بە پەرەی دیاردە جیهانییەکان، میکانیزمی گەیاندە ئەوپەڕی خۆی و سەرەنجام باوەڕی بە جۆرە "فینالیتە[55]"یەك پەیدا کردبوو. بەڵام بە بیروڕای ئەسپێنسر، ئەو فینالیتەیە بەشێك بوو لە گۆڕان. هەروەها بە کۆمەڵە قۆناغگەلێکی لە قەڵەم نەدا کە بوونەوەرێکی نادیار بۆ گەیشتن بە "هاوسەنگی" تێیان ئەپەڕێنێت. جیا لەوەش ئەم هاوسەنگییە لای ئەسپێنسر، شتێکی بڕاوە (قطعي) نەبوو و هەروەها تەمەنێکی درێژخایەنیشی بۆ قایل نەبوو.

ئەسپێنسر، شیکردنەوە و تێکدانی توخمە جۆراوجۆرەکان ـــ کەلای ئەو مانای "هەڵوەشانەوە و داڕزان دەدات ـــ بەرەوتێکی دژە گۆڕان لە قەڵەم نەدات.

ئەسپێنسر لە رووی سیاسییەوە کۆن پارێزە (محافظە کار) بەڵام بە شێوەیەکی پێچەوانەی کۆنت. بە ڕای ئەو، ئیرادەی تاکەکەسی تا رادەیەك بە هیچ شێوەیەك و لە هیچ مەسەلەیەکدا کاریگەری نییەو، گۆڕانکاری گشتیش، هەڵقوڵاوی هەندێ عادەتی "بەرهەست"ە کە لە هەندێ تایبەتمەندی بۆماوەیی ئۆرگانیکەوە سەرچاوەی گرتووە. خاوەن ئیختیاری راستەقینەی چارەنووسی جەماوەریش، "جیهەتی"و خواستەکانی خودی ئەوانە، کەواتە، بەڕای ئەسپێنسر هەموو بڕیارێکی تاکەکەسی بە مەبەستی گۆڕان دروست کردن، تەنانەت لە لایەن دیکتاتۆرێکی عاقڵەوە ـــ وەك کەسێك کە ئاگۆست کۆنت تەسەوری نەکرد ـ رەت کراوەتەوە و شتێکی ناعەقڵانییە. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگاکان بە ئاسانی خۆیان لەگەڵ بارودۆخگەلی تازەدا رێك ئەخەن.

ئەسپێنسر، هەوڵی ئەدا پاسایەکی گشتی بۆ گۆڕانی کۆمەڵگەکان دابنێت. بەڕای ئەو، کۆمەڵگاکان دوو جۆرن:

1ـ جۆری سەربازی، کەتیایدا جەبرو زۆر و دەسەلات زاڵە (فیۆدالیتە)

2ـ جۆری پیشەسازی، کە لەسەر بناغەی دابەش کردنی کار دامەزراوەو تیایدا بەرهەمهێنەران، ئەندازیاران و کارخانەدارەکان جڵەوی دەسەلاتیان بەدەستەوەیە.

سەرەنجام ئسپێنسەر، لەو رووەوە کە کردەوەگەلی جۆراوجۆری کۆمەلایەتی بە کردەوگەلی ئۆرگانیزم دەشوبهێنێت، بەیەکێك لە بناغەدانەرە سەرەکییەکانی ئۆرگانیسیزم دەژمێردرێت. بەلام ئەوەش دەهێنێتەوە یاد کە سەرجەمی ئۆرگانیزمی حەیوانی، تەنها یەك دەزگای دەماری هەیە، لە کاتێکدا، لە جەستەی کۆمەلگەدا هەموو ئەندامان، ئەو دەزگایەیان هەیە. ئسپێنسر لەو مەسەلانەی سەرەوە، بەو دەرەنجامە گرنگە دەگات کە، لە بەر ئەوەی شعوور و هزری کۆمەلایەتی لە یەکێکەیەکی تاکەکاندایە، نەك لە هەموویاندا، کەواتە ئامانجی ژیانی کۆمەلایەتیش "تاکە". بەواتایەکیتر ئامانج "تاك"ە، نەك کۆمەڵ.

## نیچە، یان بەرپەرچدانەوەی دژەمەسیحی (1844-1900ز)

هەرچەند نیچە، بە شێوەیەکی تایبەتی و رەسمی سۆسیۆلۆگ نەبوو، بەلام بە شێوەی ناراستەوخۆ، کاریگەرییەکی یەکجار گرنگی لەسەر ئەندێشە کۆمەلایەتی و سیاسییەکاندا هەبوو. چوونکە بۆ یەکەم جار دەستی کرد بە رەت کردنەوەی سوننەتەکانی "مرۆڤ دۆستی" و یەکسانی خوازی، کە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی مەسیحییەتەوە تا ئەو سەردەمە، بەلانی کەمەوە، بە شێوەی زارەکی و رواڵەتی لە ئارادابوون. پاشان خۆی بە پاڵەوانی ئاکارێکی ئەریستۆکراتیك لە قەڵەم دا و رایگەیاند کە بێ گومان کۆمەلانی خەڵکی نەبێ ببنە قوربانی ئینسانە گەورەکان. ئەو پیاوە مەزنانەی کە نیچە باسیان دەکات، نابێ پابەند بن بەو رەحم و بەزەییەی کە تەورات و ئنجیل و قورئان لەسەر خەڵکیان واجب کردبوو. بە کورتی، بۆ کەسێکی ئەریستۆکرات، هەموو شتێك رەوابوو، وە ئەمەش لە راستیدا، ئەهیلیزمێك بوو کە کۆمەلانی خەڵکی دڵسارد دەکردو، دەسەلاتدارانیشی دڵخۆش دەکرد. نیچە بە هەموو توانایەوە، قسە لەسەر "قەداسەت"ی رۆمانتیکی نەفسانیات نەکات و دەڵێ "پاش سەرکوت کردنی نەفسانیات،

ئیدی چ شتێکمان بۆ نەمێنێتەوە؟" ئەو شتەی کە خۆی بە "ئیرادەی ئیختیار" ناودێر دەکات، لە سەروو هەموو شتێکەوە دادەنێت و لەو بڕوایە دایە کە دەبێ "لەسەرووی چاکە وخراپەدا" دابنرێت، بە شێوەیەك کە هیچ مرۆڤایەتی و جوامێرییەك ڕێ لە جێبەجێ کردنی نەگرێت.

نیچە وای پێشبینی کرد کە "سەدەی بیستەم، سەردەمی کلاسیکی جەنگ" ئەبێت. ئەو، کە لە فەساحەت و ڕەوانبێژیدا، جگە لە ژان ژاك رۆسۆ، هاوتای نەبوو، کاریگەرییەکی گەورە و لە هەمان کاتیشدا فرەچەشنی لەسەر بیروڕای گشتی دانا، چوونکە تایبەتمەندی هەمەجانە فکرییەکانی نیچە لەوەدایە کە، ناتوانین بەرنامەیەکی دیاریکراویان لێهەڵێنجێنین.

لێرەدا دیارنییە کە ئایا مەبەستی لە "گەورە پیاو" مورتازێکە، یان فەیلەسووفێکی گومانکار، یان جەردەیەك؟ زۆربەی سۆسیۆلۆگەکان هەوڵیان داوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە، بەڵام نیچە هەروا لە ناو تەمومژدا هێشتوونیەتەوە.

تێزەکەی نیچە لە مەسەلەکانی تریشدا هەر بەو جۆرەیە. بۆ نموونە، ئایا مەبەست لە "ئیرادەی ئیختیار" مل هۆڕنتییە بە سەر کۆیلەکاندا، یان دزی کردنی نەترسانە، یان توندو تیژی کردن لەگەڵ نەفسدا؟ ئایا "حاڵەتی سەربازی ڕۆح" بە واتای ئازایەتی پاڵەوانێکی کەڵەگەتە، یان خۆڕاگری فکرێکی سەرکێشە لە بەرانبەر زۆرداری و کۆیلەتیدا؟[56]

نیچە هیچ بایەخێکی بە دەسنیشان کردنی بیروڕاکانی خۆی نەدەداو هەر بەم هۆیەشەوە، شێوەگەلێکی جۆراوجۆری دژەناکاری، خۆپەرستۆتەپاڵی، کە فەسابییەکان و کوشت وبڕەکانی نازیسم گرنگترینی ئەوانەیە. بەهەر حاڵ نیچە، لەو بڕوایەدایە کە دەبێ ئەریستۆکراسییەکی تازە بهێنرێتە ئاراوە کە لە هەموو کۆت و بەندەکانی ئاکار، خاکەڕایی، جوامێری و بەزەیی و ڕەحم بەدووربێت. ئەم ئەریستۆکراسییە ئەبێ خاوەنی ئاکارێکی سووکانە بێت و، نەك لە ڕووی دڵسۆزی و دلۆڤانییەوە بەڵکوو وەك ئامرازی "لەسەرتربوون" و هەروەها وەك شتێك کە ئەتوانێت بیخاتە خزمەتی ئیرادەی ئیختیاری خۆیەوە، چاوی لێبکات.

بەشی دووهەم

# قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵناسی

ئاسەوارەکانی هێربێرت ئسپێنسر، لە رووی زەمەنییەوە، دواهەمین بەشی سیستمەکانی سۆسیۆلۆژییە، واتە ئەو سیستمانەی کە هەوڵیان ئەدا، دیاردەکۆمەلایەتییەکان لە روانگەیەکی گشتی و جیهانییەوە بخەنە بەرباس و لێکۆڵینەوە. تایبەتمەندی هاوبەشی قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی دوای ئسپێنسر، ئەوە بوو کە هەر کامیان، بایەخیان بەیەکێك لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەلایەتی ئەداو، دواتر ئەم رەوشە بە "سۆسیۆلۆژی هۆکارەکان" ناوبانگی دەرکرد.

"تیۆری هۆکارەکان" و هەروەها، بەوتەی یەکێك لە مامۆستایان "تیۆریە تاك رەهەندییەکان" بەگشتی لایەنێکی هاوبەشیان هەیە و ئەو لایەنەش ئەوەیە کە هەموویان روانگەیەکی دینامیکیان هەیە. ئامانجی ئەم تیۆریانە، بەمزۆری ئیستدلالی گۆڕانکارییە کۆمەلایەتییەکانە. هەڵبەتە ئەم گۆڕانکارییانە، زۆر ئاشکران و تەنانەت قابیلی ژماردنیشن. بەلام ئەم ئاشکرابوونە، سەبارەت بە هۆکارەکانی ئەم گۆڕانکارییانە کە شلەژاون و تەنانەت زۆربەی کات نایانبینین، راستی لەخۆ ناگرێتو بە مەبەستی دەرك کردنیان، پێویستە راڤە و لێکۆڵینەوە لەسەر رووداوەکان بکرێت.

بێگومان، داهێنەرانی ئەم تیۆریانە، ئاگاییەکی باشیان هەیە سەبارەت بە ئاڵۆز بوونی ئەو هۆکارانەی کە کاریگەرییان هەیە لەسەر گۆڕانکارییە کۆمەلایەتییەکان و، کەواتە باس لە سەرگرنگایەتی و رادەو کاریگەرییەکانی هەرکام لەو هۆکارانە ئەکەن.خاڵە هاوبەشەکانی ئەم تیۆرانە بریتییە لە:

1ـ زیاتر بە دوای هۆکاری سەرەکیدا ئەگەرێن؛

2ـــ بەدمگمەن ئەوە قبوولّ دەكەن كەهەندێ مەسەلە، كاریگەریيان لەسەر رۆڵی ئەم هۆكارانە دانابێت. چوونكە نەوشتەی كە ئەمرۆ بە هۆكارێكی كاریگەر لە قەڵەم دەدرێت، رەنگە رۆژێكیتر، بە هۆی هەندێ بارودۆخ و رێكەوتەوە، تەنها رۆڵی هۆكارێكی پلە دووهەم بگێرێت و رەنگە لە هەمان كاتیشدا بتوانێت پاش دواكەوتنێكی كەم تا زۆر درێژخایەن، بە هۆی هەندێ كەش وهەوای تازەوە، گرنگایەتی جارانی خۆی بە دەست بهێنێتەوە.

### قوتابخانەی سیكۆلۆژیک

بەرجستەترین نوێنەری ئەم قوتابخانەیە "گابریێل ترارد"ە (1843-1904). بەرای ئەو، سیكۆلۆژی بەسەر بایۆلۆژیدا زاڵەو هەروەها لەو باوەرِەدا بوو كەهۆی سەرەكی دیاردە كۆمەڵایەتییەكان، ئەو رەوتە زەینییە تاكەكەسییانەن كە بەردەوام دووبارە دەبنەوە.

دوو مەسەلەی یەكجار گرنگی كۆمەڵایەتی بریتین لە، داهێنان، واتە دیاردەیەكی تەواو تاكەكەسی كە تەكنیك و رێكخراوە تازەكان نەهێنێتە ئاراوە، ئەوی تریان، لاسایی كردنەوە، كە داهێنان لە رێگەی ئەوەوە بڵاوە دەبێتەوە.

وەك پێناسەیەك دەتوانین بڵێین، كۆمەڵگا بریتییە لە گرووپێك لە تاكەكانی مرۆڤ كەلاسایی یەگدی ئەكەنەوە. بە بیرورِای "ترارد" لاسایی كردنەوە دوو جۆری سەرەكی هەیە: یەكێكیان، لاسایی كردنەوەی داب و نەریتەكان لە نێوان وەچەكاندا. ئەوی تریان، لاسایی كردنەوەی رێورِەسم و داب و نەریتەكان، لە نێوان خەڵكانی هاوچەرخی یەگدی. بەگشتی دواكەوتوولن لاسایی پێشكەوتووان ئەكەنەوە، واتە ئێمە بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیك، لاسایی ئەو كۆمەڵگانە ئەكەینەوە كە لای ئێمە حەیسییەت و دەسەڵاتێكی زیاتریان هەیە. ترارد، دوو جۆر لاسایی كردنەوە دەسنیشان دەكات: یەكێكیان كەڵك وەرگرتنی كامڵ و هەمەلایەنە لە "مۆدێل". ئەوی دیكەیان جێ كردنی شكڵێكی پێچەوانەی نموونەی سەرەكی (لاسایی كردنەوەی پێچەوانە.)

ئەو، ژیانی کۆمەڵگەکان بە دەریاچەیەك دەشوبهێنێت کە دایمە شەپۆل دەهاوێت.(واتە لە جموجۆڵ و حەرەکەتدایە). ئەم شەپۆلانە زۆربەی کات، لەیەکتری ئەدەن و لە ئەنجامی ئەو پێکدادانەدا، یان لەگەڵ یەکدی رێك ئەکەون، یان لە دژی یەك ئەبن.

سیکۆلۆژی کۆمەڵایەتی، بە بیروڕای تراد، سیکۆلۆژییەکی نێوان هزرییە (بین الافکار) یاساکانی دەبێ ئەو پرەنسیبە جۆراوجۆرانە دەسنیشان بکەن کە تاکەکان بە تەنهایی، یان بە کۆمەڵ دزە ئەکەنە ناو یەکلییەوە و کاریگەری لە سەریەکتری دادەنێن.

بە گرینگ و بنەرەتی لە قەڵەم دانی دیاردە سیکۆلۆژییەکان، لە ناو زۆربەی سۆسیۆلۆگەکانی تری وەك، "والکس ویلێر[57]"، "وێستر مارك[58]"یشدا بەرچاو دەکەوێت. لە دیدگای هەندێکیشەوە، غەریزەکان و خواستەکان، هۆکاری سەرەکی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانن. شێوە بیرکردنەوەی سۆسیۆلۆگە ئەمەریکییەکان وەك، "گیدینگ[59]"، کۆلی[60]"، "سماڵ[61]" و، بە تایبەت "ماك دۆگاڵ[62]"یش لەو جۆرەیە.

لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵانی خەڵکیش، سەرنجی زۆربەی هزرمەندانی بەلای خۆیدا راکێشاوە. زۆربەی ئەو کەسانەی کە تا ئێستا ناومان بردن، لەو بڕوایەدان کە ناتوانرێ ، بە سەرجەم بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵێك بڵێین "کۆمەڵ"، بەڵکوو "کۆمەڵ" لە راستیدا جۆرە"یەکە"یەکی سیکۆلۆژیکی جیاواز لە رۆحییە تاکەکەسییەکانە، لێکۆڵینەوەگەلی باس کراو، زیاتر لەسەر هەندێ دیاردەدا ئەنجام دراوە وەك، خۆپیشاندانە نائاساییەکانی کۆمەڵانی خەڵك، توندوتیژی، جینۆساید، قەڵاچۆکردن. شۆڕش و ..... کە ئەو دەرەنجامە رەشبینانەی لێ کەوتۆتەوە کە هەمیشە کۆمەڵانی خەڵك بە کوێر، توندڕەو، یان جینایەتکار ئەناسێنێت. هەڵبەتە ئەمە داوەرییەکی سەیر و کینەتۆزانەیە، چوونکە لە بەرانبەر هەر شۆڕش، یان خۆپیشاندانێکی توندڕەوانە63دا، دەتوانین هەزاران "کۆمەڵ"ی ئارام و گوێڕایەڵیش بەدیبکەین.

دەتوانین قوتابخانە ئەڵمانییەکانی "هێربارت"، "لازاروس"، "ئشنیتاڵ" و هەروەها لێکۆڵینەوەکانی "گوستاو لۆبۆن"، "فۆئیە"، "گیسرلینگ"، "ئالی فور"، "مادلریاگا" و... کە لە سەربناغەی سیکۆلۆژی گەلان راوەستاون، بە قوتابخانەگەلی پسیکۆلۆژیك لە قەڵەم بدەین.

قوتابخانە سیکانالیتکەکانی "فرۆید"، "یوونگ" و "ئادلێر"یش رۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە لە سۆسیۆلۆژی سیکۆلۆژیکدا. ئەم قوتابخانانە، هەندێ ئیستدلالیان هەیە لەمەڕ کاریگەریگەلێکی بە گشتی "خودئاگا" و تی پیك. ئەو هۆکارانەش کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەکەن، زیاتر بریتین لە بارودۆخی کۆمەڵگا و لەگەڵ ئەوەشدا وێڕای ئەو رەنگدانەوە و پێکادانانەی کە هەڵقوڵاوی زۆر و گوشارە کۆمەڵایەتییەکانن، بەرهۆکارەکانیشیان دەس نیشان دەکەن.

## قوتابخانەی مکانیزم و بایۆلۆژی

ئەتوانین ئەم ناوانە لەسەر ئەو قوتابخانە تەواو بگۆڕانە (متغیر) دابنێین کە، بەدەست پێکردن بە دیدگاگەلێکی جیاوازەوە، بە هەندێ دەرەنجام کۆتاییان پێدێت کە هیچ بیروڕایەکی فینالیستی و هەروەها هیچ جۆرە باوەڕێکیان نێدانییە سەبارەت بە ئەگەری وەرگۆڕانی مرۆڤایەتی.

لە ژێرناوی نوێخوازی و بە ئیلهام وەرگرتن لە زانستەکانی فیزیك و بیۆلۆژیك، دەتوانین فاتالیزمی تاریك و تەسلیم خوازانەی ئیبنی خەلدوون و هۆبس بەدی بکەین.

دستەی یەکەمی ئەو گرووپە، ئەو کەسانەن کە بوونی هەموو جۆرە تەقدیرێك بەمەبەستی رێنمایی کردنی دایمەی مرۆڤ بەرەو پێشکەوتن و سەرکەوتنی، رەت دەکەنەوە و لەم رووەوە لە هزرمەندانی سەدەی هەژدەهەم بە تایبەت "دێکارت"، "ئسپینۆزا"، "گرۆتیۆس"، مالبرانش"، "هۆبس"، لایب نیتز" و تەنانەت "بیل" ئەچن. چوونکە ئەم هزرمەندانەش دژایەتی هەمووجۆرە فینالیزم و مۆرالیزمێکیان دەکرد کە لە سەدەکانی دواتر گرنگییان پێدرا.

لە روانگەی سۆسیۆلۆگەکانی وەك، "پارتۆ[64]"و کاری[65]" دا، کۆمەڵگا بریتییە لە سیستمێکی هاوسەنگ. هاوسەنگییەك کە لە هەموو بوارە مادی و رۆحییەکانی خۆیدا، پێرەوی لە یاسای "بێجموجوڵی" دەکات. هەر بەم هۆیەوە "زەروورەت"، یان حەقیقەتی رەها هیچ مانایەکی نییە. بە بڕوای ئەوان، دەبێ دوو چەمکی "بگۆڕ" و "کردە" لە جێی هۆکار و بەرهۆکار دابنرێت، چوونکە دیاردەکان، وابەستەییەکی هاوبەشیان هەیە. هەروەها هاوسەنگییە کۆمەڵایەتییەکان ـ بە هۆی ئەو رووداوانەی کە رەنگە قابیلی پێشبینی کردن نەبن و یان تەنانەت بە هەڵکەوت روویدەن و لەگەڵ ئەوەشدا هەڵقوڵاوی گۆڕانکارییە جوراوجۆرەکان بن، هیچ جۆرە فینالیتەیەکی باش یا خراپیان تیانەبێت ـ تێك دەچن.

### پارتۆ و قوتابخانەکەی

ئیکۆنۆمیستە سەرەتاییەکان یان وەك، "کسحی" بیۆلۆژیست، یان وەك ئادام ئسمیت فەیلەسووف بوون و بە پیچەوانەی مارکس و پارتۆ، لە ئابورییەوە دەستیان پێکرد و دوایی چوونە ناو سۆسیۆلۆژییەوە و ئەم دوو زانستەیان بە تەواوەتی تێکەڵی یەکدی کرد. پارتۆ، "والراس" و "کۆرنۆ" لە بناغەدانەرانی ئابووری ماتماتیك بوو پارتۆ ئەیویست میتۆدە راڤەکارییەکانی ملتماتیك بخاتە ناو سۆسیۆلۆژییەوە.

ئەتوانین بڵێین تا سەردەمی پارتۆ، هەموو سۆسیۆلۆگەکان، نیمچە باوەڕێکیان بە عیرفان هەبوو. هەموویان کەم تا زۆر باوەڕیان هەبوو بە خواستێکی سەقامگرتووی بنەڕەتی و هەروەها ئامانجێك کە مرۆڤ سەرەڕای هەموو وێرانییەکان، هەوڵ ئەدات پێی بگات. زۆربەشیان، لە رێنسانس بەدواوە باوەڕیان بە جۆرە گۆڕانێکی کەم تازۆر، حەتمی هەبوو: هەندێکیان لە ژێر ناوی گەشەسەندنی رووڵە زیادبوونی شارستانییەت و هەندێکی تریان بە ئاشکرا لە رێگەی تیۆرەکانیانەوە سەبارەت بە پێشکەوتنی مرۆڤ ئەو بابەتەی سەرەوەیان بەیان ئەکرد.

لە لایەکیترەوە، سۆسیۆلۆژی هەوڵی ئەدا، ببێتە خاڵی بەرانبەری میتۆدە "گێڕانەوەیی"یەکانی مێژوونووسان. مێژوونووسان، هەمیشە لە زۆرکاریگەری رووداوە پڕ جەنجاڵ و تراژیك و تیاترالّەکانـدا بـوون و هەمیشە گێڕانەوەی بشێویگەل و کارەساتەکانیان لە سەرووی بابەتەکانی ترەوە دادەنا. بەلاّم سۆسیۆلۆگەکان، بە پێچەوانەوە، وایان پیشان داوە کە رووداوگەلی ناوبراو، شتانێکی لاوەکی و بێ بایەخن چوونکە رووداوە تەواو سەرنج راکێشەکانی مێژوو، لە دیدی ئەوانـەوە، تەنها گۆڕانێکە کە لە ناو سیستەمەکان، شێوەی ژیان، زانیاری، بیروباوەڕو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی گەلاندا هاتۆتە ئاراوە. سیستەمە گەورە سۆسیۆلۆژیکەکانیش، هەمیشە هەوڵی ئەوەیان داوە کە لە مانـای هەر ئەو گۆڕانکارییانە تێبگەن، بەلاّم ئەم لێکۆڵینەوانە، دەست ئەگەن بە پاساوهێنانەوەو، ئەو سیستەمانە بە خەیاڵی ئەوەی کە مانای گشتی گۆڕانی کۆمەڵگایان دۆزیوەتەوە، بۆ داکۆکی کردن لە بیروڕاکانیان، پشتیان بە بەڵگە مێژووییەکانەوە بەستووە.

هەر ئەم دەگەڕانە، لە نـاو تیۆری هۆکارەکانیشدا دەبینرێت. هەر کام لەوانە، بێ‌لەسەر ئەفزەلییەتی "هۆکاری خود" دائەگرن و بۆ سەلماندنی تێزەکەیان، پێرستێك لە رووداوەکان ئامادە ئەکەن. پارتۆ، بۆ خۆپاراستن لەم مەسەلەیە، سەرەتا لەو باوەڕەدا بوو کە هەموو کۆمەڵگایەك بریتییە لە "سیستەمێکی هاوسەنگ" لە نێوان هێزە جۆراوجۆرەکانداو، تا ئەوکاتە درێژە دەکێشێت کە بە هۆی پێوەندی نێوان ئەم هێزانەوە هاوسەنگی بۆدابین بکرێت.

پاشان، پارتۆ ئەیویست هێزەناوبراوەکان بخاتە بەر راڤە و لێکۆڵینەوەوە. هەندێك لەو هێزانە ئابووریین و کەوتە لەدەرەوەی بازنەی سۆسیۆلۆژیدان. سەبارەت بە هێزەکانی تریش، پارتۆ بەمەبەستی دۆزینەوەی گرنگترینیان، هەوڵ ئەدات ئەو بەشە بنەڕەتی وسەقامگرتووە بدۆزێتەوە کە لە پشت گۆڕانکارییەکان و خۆپیشاندنە جۆراوجۆرەکانیاندایەو بە هۆی شیکردنەوەوە، جیا دەکرێتەوەو دەسنیشان دەکرێت.

گۆڕانی کۆمەڵگاکان گرێدراوە بە ڕادەی ئەو هێزە جۆراوجۆرانەوە، بەڵام ئەم ڕادەیەشی ڕەنگە بگۆڕێت و شێوەگەلێکی تازەی هاوسەنگ و زۆربەی کات چاوەڕوان نەکراو، بهێنێتە ئاراوە. کەواتە، بە هیچ شێوەیەك ناتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین کە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان قابیلی پێشبینی کردنن.

باوەڕگەلێکی ڕەش بینانە کە بەتەواوەتی نوێنەری ڕۆحی دژایەتیکەرانەی ئەو بوون، هەرچیزیاتر جیاوازی بیروڕاکانی لەگەڵ تیۆرە کلاسیکەکان ئاشکرا دەکا. پارتۆ ڕەخنە لەوکەسانە دەگرێ کە قسە لەسەر پێشکەوتنی هەتایی و تەنانەت دیمۆکراسی ئەکەن و، هەروەها دەیەوێت بە هۆی هەندێ بەڵگەی دژبەیەکەوە، ئەوانەی کە باوەڕیان بە پێشکەوتنی ئاکاری هەیە، قەناعەت پێبکات کە مرۆڤ لەبەرئەوەی کە بوونەوەرێکی بە تەواوەتی نیازمەندەو هەروەها لە نێوان هەندێ پرەنسیپی تەنانەت پووچیشدا قەتیس ماوە، کەواتە، خورافات تیانەچووە، بەڵکوو جێگای ئەگۆڕێت. پارتۆ، کە بیروڕاکانی وەك ئەوانەی فرۆید وان. لێکۆڵینەوە لەسەر "ئامبی والانس"[66]ی خواستەکان ئەکات و بۆ نموونە، ئەوە دەستنیشان دەکا کە سێکس‌خوازی ڕێبەران و دەسەڵاتداران ڕەنگە بە هەندێ مەسەلەی وەك داوێن پیسی، یان خۆ بە پاك نیشان دان و هەندێ توندوتیژی کۆتایی پێبێت. پارتۆ، سەرەڕای لایەنی مکانیکی بەڵگەکانی، گرنگییەکی زۆر بۆ جیاوازی تاکەکان، قایل بووە و ئەو جیاوازییانەشی پۆلێن دەکرد و پێی وابوو کە تاکەکان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە نایەکسانن. ئەم پۆلێن کردنە، بریتییە لە دیاردەی "گواستنەوەی هەڵکەوتوەکان"، واتە جێگۆڕکێ کردنی دایمی تاکە بەهرەدارەکان، لە چینەکانی خوارەوە بۆ چینەباڵاکان. چۆنیەتی بەدی هاتنی مەسەلەی گواستنەوەی هەڵکەوتوەکان، یەکێکە لەو لایەنە تایبەتانەی کە جیاوازی گرووپەکانی کۆمەڵگا بە باشترین شێوە دەستنیشان ئەکات.

"م.س.جیهی[67]" بە درێژەپێدانی ئەندیشەکانی پارتۆ، بە شێوەیەکی زانستی، ئاکام گەلی بگۆڕی هەڵبەزودابەزی هاوسەنگییە کۆمەڵایەتییەکانی،

به تایبەت لە بواری ئابووری‌دا خستۆتەبەر لێکۆڵینەوەو لەو بڕوایە دایە کە هەندێ لەو هەڵبەزو دابەزانە (نوسانات) ناکامگەلێکی کاتی، یان بەرتەسکیان هەیە، هەندێکیشیان گۆڕانکاریگەلێکی گرنگ و بنەڕەتییان لێ‌نەکەوێتەوەو سەرەنجام هەندێکی تریان، دەبنە هۆی شێواندنی هاوسەنگییەکانی پێشوو و تەنانەت دەبنە هۆی شۆڕشێکی توندو بە هۆی ئەم شۆڕشەوە، سیستمێکی هاوسەنگ و هەروەها پێوەندیگەلێکی تازەی کۆمەڵایەتی هێدی هێدی سەرهەڵدەدات. ئەم ڕەوتانە بە هیچ شێوەیەك پێشبینی ناکرێن و پێوەندیگەلی تازەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان، زۆربەی کات، لە ڕووداوە کەم بایەخ و بەهەڵکەوتەکانی قۆناغە قەیرانییەکانەوە سەرهەڵدەدەن.

## تێزە ڕەگەزییەکان و هەڵبژاردنی ڕەگەز

لایەنی گشتی ئەم تێزانە، جۆرێك فاتالیزم و ئەریستۆکراتیکە. لە دیدگای ئەم تێزانەوە، جیاوازی شارستانییەت و هێزی گرووپە جۆراوجۆرە ئینسانییەکان، گرێدراوە بە بەهرە زگماکییەکانی هەر ڕەگەزێکەوە. کەواتە هەر ڕەگەزێك بۆ پلەو پایەیەك هەڵبژێردراوە کە حەتمەن دەبێ پێی‌بگات.

ئەم تیۆرە، بە شێوەگەلێکی جۆراوجۆر، تا ڕادەیەك لە ناو هەموو کۆمەڵگا دێرینەکاندا بەرچاو دەکەوێ. لە قۆناغی خێڵایەتی‌دا، هەموو ئەندامانی خێڵ، بە هۆی پێوەندیگەلی بنەماڵەیی‌یەوە خۆیان بەوابەستەی یەکتری ئەزانن و لەو بڕوایەدان کە بە هۆی باوکێکەوە کە بناغەدانەری "سیتە"یە، یان ئاژەڵێك کە دەیپەرستن، یان تەنانەت بەهۆی خوایەکەوە خوڵقێنراون و ڕەگەزەکانی‌تر وەك ڕەگەزی ناپاك، بێ‌دین یان خوارتر لە قەڵەم ئەدەن و سووکایەتییان پێ‌دەکەن. بەڵام هەرکات بوار بڕەخسێت و گرووپێکی بچووك، یان خێڵێك، یان دانیشتووانی وڵاتێك ژمارەیان ڕووی لە زیادبوون کرد، لایەنگرانی ئەم تیۆرانە، ڕووبەڕووی جیاوازیگەلی زمانی، مەزهەبی، شارستانی و ڕەگەزی دەبنەوە. یۆنانییەکانیش، لە کاتێکدا کە لە نێوان خۆیان و گەلە دواکەوتووەکانی دیکە جیاوازی قایل دەبن، ڕووبەڕووی

ئەو جیاوازییە ناوخۆییانە دەبنەوە، سەرەڕای هەموو ئەم مەسەلانە، چینییەکان بەم نەفسانەیە وەفادار مانەوە و هەنووکەش خۆیان بە مناڵانی "هان" یان مناڵانی "سەدبنەماڵە" دەزانن.

لەرەوتی سەدەی نۆزدەهەمیشدا، چۆنایەتیە شێروونیەکان، لەگەڵ تیۆرە ڕەگەزییەکاندا تەبابوون. تا ئەو سەردەمە جیهان، بە هەندێ شارستانییەتی گەورە، کە هەموویان هێندەی یەکدی خاوەنی پیشەسازی بوون، دابەش دەکرا. ئەم شارستانییەتانە، لە رووی مەزهەبی، ئاگاری و فەرهەنگییەوە سووکایەتییان بە یەکتری دەکرد و بۆ نموونە چین، ژاپۆن، دنیای مەسیحییەت و دنیای ئیسلام، یەکتریان بە وەحشی و کافر لە قەڵەم ئەدا.

لەسەدەی نۆزدەهەمدا، شارستانییەتی ئەورووپایی، سەر کەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا؛ لەکاتێکدا کە هاوچەرخەکانی لویی پانزدەهەم، بە شێوەیەکی ئاسایی، پاشای عوسمانییان بە "بەهێزترین سوڵتانی جیهان" ناودێر ئەکرد. ساڵی 1760ز ئیمپراتووری تورک، "لەگیانەڵاندابوو، چینیش دەوڵەتێکی تێکشکاو بوو کە پاشماوەکانی لە لایەن ئەوانی ترەوە دابەش دەکراو بە تاڵان ئەبردرا. ئیمپراتووری ژاپۆنیش، زیاتر وەك تەختەی نۆپێرات وابوو. لە خۆبایی‌ترین شارستانییەتەکان، بە شێوەیەکی خاکەڕایانە روویان لە قوتابخانەی خۆرئاوا دەکردو. بە کورتی، سەدەیەك دوای "پێتری مەزن" هەموو وڵاتانی جیهان، پێرەوییان لەو دەکرد و بە رێگای ئەودا دەچوون.

هەڵبەتە ئەم بارودۆخە بە تەواوەتی لە ناو تیۆرە جۆراوجۆرەکاندا رەنگی نەدایەوە. هەر بەم هۆیەوە، سەرەتا تیۆری زمانناسی کە گرنگییەکی تایبەتی ئەدا بە زمانە هیندو ئەورووپاییەکان و هەروەها ئەو گەلە سەرکەوتووانەی کە بەو زمانانە ئەپەیڤین. پاشان تیۆری "گۆبینۆ" سەبارەت بە نایەکسانی رەگەزەکانی مرۆڤ هاتە ئاراوە.

بە بیروڕای گۆبینۆ، هۆکاری سەرەکی پێشکەوتن، یان هەڵوەشانەوەی هەر کۆمەڵگایەك، هۆکاری رەگەزییەو رووخان و هەڵوەشانەی هەر گەلێك لەبەر

ئەوەیە کە پێکهاتە رەگەزییەکەی بەهۆی تێکەڵ بوونی خوێنەوە گۆڕدراوە. لە لایەکی ترەوە گۆبینۆ، رەگەزەکان بە دووبەشی "پەست" و "باڵا" دا بەش ئەکات و لەو بڕوایەدایە کە زۆربەی رەگەزەکان، هەرگیز توانای بە شارستانی بوونیان نییە. چوونکە هەندێکیان، لە ناوچەگەلێکدا دەژین کە سەرەرای خۆش ئاووهەوا بوونیان، هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدا ماونەتەوە. بە بیروڕای ئەو، سێرەگەزی مرۆڤ واتە سپی، زەرد و رەش، سەرچاوە گەلی جۆراوجۆر و لێکجودایان هەیە و بە ناچاریش هەندێ تایبەتمەندی سەقامگرتووی سیکۆلۆژیکییان هەیە کە تەنها تێکەڵ بوونی خوێن دەتوانێ بیانگۆڕێت. گۆبینۆ دژی تێکەڵ بوونی رەگەزییە، بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە پێیوابوو تێکەڵ بوون، بەهرەی داهێنان و رەسەنایەتی رەگەزی سپی ــ کە شارستانییەتی مۆدێرنی هێناوەتە ئاراوە ــ لە ناو دەبا و لە ئاکامدا یەکدەستیتی (یکنواختی) و چاکێتی و ئیمتیازەکانی لێ دەسێنێتەوە. لەم حاڵەتەدا، "هەموو ئینسانەکان لە رووی جەستەو تایبەتمەندییەکان و هەروەها ئاکارەوە وەك پۆلینزییەکان یەکدەست ئەبن".

تێۆریەکانی گۆبینۆ زێدەڕەوی گەلێکی زۆریان تیاکراو دواتر، لە ریزی تیۆریەکانەوە چوونە دەرەوەو کەوتنە ریزی تێزە سیاسییەکانەوەو لە ئاکامدا، جیهانیان غەڵتانی خوێن کرد و پێشبینییەکەی "ولشر دولاپوژ" خوێندکاری گۆبینۆی هێنایەدی کە دەیگوت: "دە، بیست ساڵ دواتر، ملوێنها کەس لە خەڵکی، بەهۆی ئاکۆکییەکی بچووك لە مێشکیاندا، یەکتری کوشت و بردەکەن". ئەم پێشبینییە لە ساڵی 1900 دا ئینسانی دەهێنایە پێکەنین، بەڵام...

هەندێ کەسیش، رادەگەلێکی دیاریکراویان بۆ دەسنیشان کردنی رەگەزە جۆراوجۆرەکان پێشنیار کرد. بۆ نموونە، دابەش کردنە بە ناوبانگەکەی تاکەکانی مرۆڤ بە "دولیکۆسفال[68]" و "براشی سفال[69]" تا ئەو سەردەمە بایەخێکی زۆری هەبوو. (دولیکۆسفالەکان جگە لە رەگەزی باکووری، بە تایبەت لە ناو رەگەزی رەش پێستەکاندا، بەرادەیەکی زۆر بوونیان هەیە).

پاشان ژمارەیەك لە تیۆرییەكانی هەڵبژاردنی رەگەز هاتنە ئاراوە. ئەم تیۆرانە، بە ئیلهام وەرگرتن لە "داروینیزم"، گرنگییەكی زۆر بۆ هۆكاری بۆماوە (وراثـت) قایل بوون. لاپوژ بە توندی هێرشی دەكردەسەر پێشكەوتنە ئاكارییەكان و دەیگوت: "لە كۆمەڵگای مۆدێرندا، ئەبێتە هۆی ئاسانتر بوونی ژیانی ئینسانە كەمهێزەكان و زاوزێكردنی رەگەزە پەستەكان" هەروەها بە هەڵبژاردنێكی نێگەتیڤی كۆمەڵایەتی لە قەڵەم ئەدا كە ئەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی یەكجاری.

بەپێچەوانەوە "ئاموون[70]" بە دەست پێكردن لەو دیدگایەوە سەبارەت بە پۆلێن كردنی كۆمەڵایەتی، تیۆرێكی گەش بینانەی سازكرد. بەوتەی ئەو. رێكخراوە كۆمەڵایەتییەكان، هەر لەسەردەمی منالی و قوتابخانەوە وەك "لەمپەر"وان لەبەردەم بێلیاقەتییەكاندا و بوار دەرەخسێنن بۆ پێشكەوتنی ئەو كەسانەی كە بەهرەی زیاتریان هەیە. پاشان ئەندامانی هەر كۆمەڵگایەك بە پێیبەهرەكانیان دابەش دەكا.

بەڵام "سوروكین[80]" دەڵێ: بەمەبەستی گەیشتن بەو ئامانجەی سەرەوە، ئەبێ رێكخراوە كۆمەڵایەتییەكانیش لەبارین و دۆخی پێویستیان هەبێت. چوونكە باوەرمەندی بە تایبەتمەندییە بۆماوەییەكان، بە تەواوەتی دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەم جۆرە هەڵبژاردنی رەگەزەدا. كەواتە لەم رووەوە، سیستمی سەندیكایی، كە لە جۆری خۆیدا باشترین تێزی سۆسیۆلۆژییە كە لەسەر بنەمای پرەنسیپی "بۆماوە" دامەزرابێت، تەنها وەك "هۆكاری راوەستان" بوومو هیچیتر.

تیۆرە رەگەزییەكان، دژی ئۆمانیزم و ئایدیالیزمن. ئەم تیۆریانە سەبارەت بە ناوێكچوونی كەلتووری و كۆمەڵایەتی گەلانی جۆراوجۆر، كەڵكیان لەتێزەكانی "هێردر" وەرگرت و ئەو جیاوازییانەیان گۆری بەو جیاوازییە جەستەییانەی كە هێردر پشتی پێوە ئەبەستن. بە پێی تێورییەكەی ناوبراو، مرۆڤ داگیركراوی زنجیرە فاتالیتەگەلێكە و تەنها دوو رێگای لەبەر دەمدایە: واتە، یا دەبێ لە ترسی تێكەڵ بوونی رەگەز،

مەسەلەی نایەکدەستی و هەڵبژاردنی رەگەز درێژە پێ بدات و پەرەی پێبدات، یان لە بەرانبەر ئەم تێکەڵ بوونەدا چۆك دابدات و دوچاری هەڵوەشانەوەو رووخانێکی حەتمی ببێت کە بۆشی فەرمووناکرێتەوە.

لە ناکامدا "گالتۆن"[72]، بە رەفەکاری و تێڕامانگەلی هێمنانەوە، هەندێ دەرەنجامی بەگشتی جیاواز و لە هەمان کاتیشدا تەمومژاوی بەدەست هێنا. بە بیروڕای ئەو، ئەو بەهرانەی کە لە دواهەمین لێکۆڵینەوەدا، دەبنە هۆی دروست بوونی زنجیرە پلەوپایە کۆمەڵایەتییەکان، بە پێی "یاسای ئەگەرەکان" (قانون احتمالات)ی ماتماتیک، لە نێوان هەموو ئەندامانی گرووپێکدا دابەش کراوە. بەڵام "بۆماوە"ش لە جیاتی ئەوەی کە هۆکارێکی خۆڵقێنەری "جیاوازی" بێت، واتە، درێژە بەو تایبەتمەندییانە بدات کە بەدەستی هێناون، بە پێچەوانەوە، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ گرووپی مام ناوەندی و پلەخواری کۆمەڵایەتی. تەنانەت ئەوانەش کە ناژەڵ بەخێودەکەن و داروینیش ئیلهامی لە کارەکانیان وەرئەگرت، بە زووترین کات دەرکیان بەوە کردبوو کە هەڵبژاردنی رەگەزیش، رادەیەکی دیاریکراوی هەیە. بۆ نموونە، بە هۆی هەندێ تێکەڵ کردنی تایبەتەوە، دەتوانین مەڕێك دروست بکەین کە سەری بچووك بێت بەڵام ئەم هەڵبژاردنە لە رادەیەکی دیاریکراودا رادەگیردرێت و بەدڵنیاییەوە ئیدی ناتوانین مەڕی بێسەر بهێنینە ئاراوە.

یەکێکی تر لە لایەنە تایبەتەکانی تیۆریە رەگەزییەکان و هەڵبژاردنی رەگەز، ئەو بایەخ و ئەرزشەیە کە ئەم تیۆریانە بۆ ململانێ توندەکان بەگشتی و جەنگ بە تایبەتی قایلن. لێرەدا بەرلە هەموو شتێك، پشت بە بەلگەکانی "ئاژەڵ ناسی"یەوە دەبەستن: بۆ نموونە، مشکی ئاسیایی هێدی هێدی، رەقیبە ئەورووپاییەکەی خۆی لە ناودەبا، یان مێروولە بەهێزەکان بە کردەوەکانیان مێروولە کەم هێزەکانی تر لە ناودەبەن و.....

لە راستیدا، شوبهاندنی ململانێ کۆمەڵایەتییە مۆدێرنەکان بە جیهانی ئاژەڵان، کارێکی سووك و نەشیاوە. ئەمڕۆ، بە هەمان رێژە کە کۆمەڵگاکان،

بەرفراوانتر و عاقڵ تر دەبن و دابەش کردنی کاریش رۆژبەرۆژ پەرەدەسێنێت، هۆکارە رێکخراوییەکانیش؛ واتە هاوکاری و هاریکاری، تەنانەت لە کاتی جەنگدا گرنگییەکی زیاتر پەیدا دەکەن؛ لە ناو خێڵە سەرەتاییەکانیشدا، هەر لە قۆناغی کشت و کاڵدا، لە جیاتی کوشتاری بە کۆمەڵی بن دەستەکانیان، بە پێچەوانەوە جۆرە کۆیلەدارییەکی لێئەکەوێتەوە (واتە جۆرە هاوکارییەك ـ ئەگەرچی هاوکارییەکی هێندە دڵخواز نەبوو!!)

سەبارەت بە ئاکامە گشتییەکانی جەنگیش، هەمان ئاڵۆزێتی و زۆربەی کات دژوازییانەش لە ئارادان. بۆ نموونە، هەندێ جار ژمارەی جەماوەری سەرکەوتووان، بە تایبەت لە ناو ئەو نەتەوانەی کە فرەژنی و رەدووخستنی ژنان تیایاندا باوبوو، لە ژمارەی ژێردەستەکان زیاتر ئەبوو و، لە ئاکامدا، تێکەڵ بوونی رەگەزی، بە شێوەیەکی بەرفراوان رووی ئەدا. هەندێ جاریش لەناو شارستانییەتەکانیتردا بە پێچەوانەوە، ژێردەستەکان کە بە چینی پلەخوازی کۆمەڵگا لە قەڵەم ئەدران و رادەی زاوزێ کردنیشیان زیاتر بوو، وردەوردە، جێی چینی دەسەڵاتداریان ـ کە بە پێی دابونەریتەکانیان زیاتر لە ژنێکیان ئەدەهێناو کەواتە منداڵیشیان کەم دەبوو، هەر بەو هۆیەشەوە ژمارەیان کەمتر ئەبووەوە ـ دەگرتەوە.

## قوتابخانەکانی کۆمەڵ ناسی و رەگەزناسی

"تووسیدید" و "ویکۆ"، بۆ یەکەم جار لە رووی زانستییەوە گرنگایەتی لێکۆڵینەوە لەسەر خێڵە سەرەتاییەکانیان لەروانگەی زانستەکانەوە سەلماند. لەسەدەی هەڤدە و هەژدەهەمدا، بەیان کردنی گەشتەکان و وێناکردنی ئاکاری نەتەوە دوورە دەستەکان، بە تەواوەتی پەرەی سەند. سەرەتا، لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە تا سەدەی نۆزدەهەم، بە رق و کینەوە قسە لەسەر خێڵە سەرەتاییەکانی ئەفریقا و ئەمەریکاو ئۆقیانووسییە دەکرا. پاشان لە سەدەی هەژدەهەمدا، بەرپرچی ئەو مەسەلەیە درایەوەو ئەفسانەی "وەحشی باش" کە "برنادن دوسنت پیر"، "ژان ژاك رۆسۆ"، و "شاتۆ بریان" وێنایان ئەکرد، گرنگییەکی زۆری پێدرا.

لــه ســـەدەی نۆزدەهەمـــدا، وێنـــاکردنی عـــەینی کۆمەڵـــگا سـەرەتاییەکان دەسـتی پێکـرد. وردەوردە جـۆری ڕێکخراوەکـان و سیسـتمی خێلایـەتی و بنەماڵـەیی دەسـتی پێکـرد و هـەروەها بەڵگەگـەلی جۆراوجـۆری سـەبارەت بـە پێوەندییـەکانی نێـوان ئەنـــدامانی بنەماڵـــە و خۆشـــك و بـــراو مەســـەلە سێکســـییە قەدەغەکراوەکان دۆزرایەوە و سەرچاوەی مەسەلە قەدەغەکراوەکان و شتومەکە پیرۆزەکان (تابۆ) ئاشکرابوو.

پاشـان، دەرکیـان بـە وێکچـوونی نێـوان خێڵـە سەرەتاییەکان و گـەلانی سـەرەتاکانی مێـزوو کـرد و "ماسـکری73"ش ، وێکچـوونی نێـوان پرەنســیبگـەلی کۆمەلایــەتی "بەربــەر74"ەکــان و پرەنســیبە کۆمەلایەتییەکانی بەربەرەکانی سیتە سەرەتاییەکانی یۆنـانی دەس نیشان کـرد. بـە تایبـەت "جیمزفرایـزر75" بەڵـگەگەلێکی زۆری خسـتە ڕوو سەبارەت بەوەی کە هەندێ لە ئەفسانەو ڕێکخراوگەلی خێڵە سەرەتاییەکان، هێندی هێدی گۆڕان و بوونەتە موڵکی گەلانی تەواو شارستانی.

بەلام ئیستدلالەکانی "فرایزر" هەموویان سەبارەت بوون بـە یەکڕەوتی مکانیزمی فکری هەموو تاکەکانی مـرۆڤ. لـە کاتێکدا بـە پێچەوانەوە، لـە روانگەی "ل.لـویی بـرۆل76"دا شێوە بیرکردنـەوەی خێڵـە سـەرەتاییەکان هەرگیز وەك ئەوەی ئێمە نییە و نەك تەنها بیروباوەڕو روانگەکانیان لەگەڵ ئـەوەی ئێمـە جیاوازییـان هەیـە، بەڵـکوو شێوەی ئیستدلال و لۆژیکیشیان جۆرێکی ترە.

هـەروەها، فۆلکلـۆریش بـە زووتـرین کـات کەوتـە ریـزی لێکۆلینـەوە ئەتنۆلۆژیکەکانـەوە. رۆڵـی سـەرەکی فۆلکلـۆر ئەوەیـە کـە پاشمـاوەی شێوە بیرکردنەوەی سەرەتایی، دەخاتە ناو جەماوەری شارستانییەوە.

## گەڕانەوەی کۆمەڵناسی ئایدیالیستی

ئـەم گەڕانـەوە زیـاتر لایـەنی دینـامیکی هەیـە. بـەبیروڕای "فۆئیـە"، خواستەکانی ئێمە، ئایدیاگەلێکی چالاك ئەهێنێتەئاراوە کە درەنـگ یـا زوو، کاریگـەری لەسـەر واقعییـەت دادەنـێن و لـە گـۆڕینی بـارودۆخی ئێسـتای

جیهاندا بەشداری دەکەن. لە لایەکەوە مارکسیش بۆ ئەوشتەی کەخۆی بە "هۆکاری سۆبژێکتیڤ" ناودێری ئەکات، رۆڵێکی گرنگ قایل دەبێت و پێیوابوو ئەگەر ئاگایمان لەسەر شتە دژبەیەکەکان (أضداد) و هەروەها هەندێرەوتی زیانبار هەبێت، دەتوانین گۆڕانیان تیا دروست بکەین و لە جیاتی ئەو واقعییەتەی کە بەسەر ئینساندا ئەسەپێنرێت، واقعییەتێکی دڵخواز دابنێین.

"ژۆرژسورل[77]" تیۆرسیەنێکی ئایدیالیستی لایەنگری توندوتیژی بوو. بە بڕوای ئەو، دەبێ ڕێکخراوە حیرفەییەکان جێی دەوڵەتی ئاسایی بگرنەوەو بۆ ئەم مەبەستەش ئەبێ پرۆلتاریا، خەسڵەت و ڕۆحی ململانێی تیابێت.سورل، مل هوڕی و توندوتیژی کردنی ستایش ئەکرد و بە هەڵقوڵاوی ویستی ئیلاهی لەقەڵەم ئەدا. گاڵتەجاڕییەکە لەوەدایە کە یەکێك لە خوێنەکارە گوێڕایەڵەکانیشی موسولینی بوو، کە هەر وەك دواتر بینیمان، ئەندێشەکانی ئەوی خستە بواری جێبەجێ کردنەوە.

"برێگسۆن[78]" ئەیویست، لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆژیك بخاتە پاڵ فەلسەفەکەی خۆیەوە.بەبڕوای ئەو، بزاڤەکانی هەموو کۆمەڵگاکان، هەموو کاتێك هەڵقوڵاوی ئایدیالێکی سەرەکین و ئەم ئایدیالە، نەك بە هۆی ڕووداوەکانەوە بەڵکوو بەهۆی هەڵبەزودابەزەوە ئەگۆڕدرێت. کاتێ کە ناوەڕۆکی فۆرموول، یان سیستمێك کۆتایی دێت، یان لە ناو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەگاتە ئەو پەڕی خۆی و لە ئاکامدا دەبێتە هۆی پایداری گەلێکی ئۆرگانیك، لەو حاڵەتەدا مرۆڤ خۆی لێ‌ڕزگار دەکاو ئایدیالێکی دژی ئەوە هەڵئەبژێرێت. ئەم پاسایە، هۆی قۆناغ بە قۆناغی هەڵبەزودابەزەکانی مێژوو و هەروەها سەرهەڵدانی ئەو سیستمانەی کە بەردەوام یەکتری ڕەت دەکەنەوە دەسنیشان دەکا. جیا لەوەش تیزی "ricorci"ی "ویکۆ"مان ئەهێنێتەوەیاد.

بەلام "برێگسۆن" بۆ هەر بارودۆخێك کە جێی بارودۆخی پێشوو ئەگرێتەوە، ئەسڵییەتێك قایل دەبێ چوونکە بەڕای ئەو، گۆڕان،

مەسەلەیەکی داهێنەرەو لەبەر ئەوەی کە هەموو دیاردە رۆحی و کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان، هیچ وێکچوونێکیان نییە، هەر بەو هۆیەوە، قابیلی پێشبینی کردن نین. برێگسۆن، فاتالیزم بە تەواوەتی و بەهەرناوێکەوە بێت، رەت دەکاتەوەو ئەڵێ "ئاینەدەی مرۆڤایەتی نادیارە، چوونکە تەنها پێوەندی بە خۆیەوە هەیە".

برێگسۆن، کۆمەڵگاکان بە دوو بەش دابەش ئەکات: کۆمەڵگاگەلی کراوە و کۆمەڵگاگەلی داخراو. "لە کۆمەڵگا داخراوەکاندا، تاکەکان وابەستەن بە یەکترییەوەو بەنیسبەت ئینسانەکانی تر کەمتر خەمن و هەمیشە ئامادەن بۆ هێرش بردن، یان بەرگری کردن و، بەکورتی، تەنها تایبەتمەندییان، شەرانی بوونە. ئەمەش لایەنی تایبەتی کۆمەڵگا سەرەتاییەکانە کە هەمیشە گۆشەگیرن و خۆیان لەمەسەلەکان دوور ئەخەنەوە. کۆمەڵگای کراوەش، بەگشتی دەبێ هەموو مرۆڤایەتی بگرێتەوە. ئەڵبەتە دەبێ ئەوەش لەبەرچاوبگرین کە جیاوازی ئەم دووانە لەرووی چۆنیەتییەوەیە، نەك چەندایەتی.

برێگسۆن، لەبەرانبەر ئەو تیۆریانەی کە فکرو کردەی تاکەکان بە "بەرهۆکار"ی (معلول) بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکەیان لە قەڵەم ئەدەن، دەڵێ: "ئەریستۆکراتەکانیش لە شۆرشی 1789 دا[79] کە خەسڵەتە بۆماوەییەکانیان پاراستبوو، بەشداریان کرد." وە بەگشتی دەس پێکردنی هێرش لە دژی نایەکسانی، زیاتر لە سەرەوە، واتە، بنەماڵە دەوڵەمەندەکانەوە بوو، نەك لە خوارەوە، واتە، چینە هەژارەکان. لە کاتێکدا، ئەگەر مەسەلەکە تەنها بەرژەوەندی چینایەتی بوایە، ئەبوایە چینەکانی خواروو ئەو کارەیان بکردایە. بە بڕوای ئەو، لێرەدا دیاردەی سەرەکی "بیر و باوەڕ"ە، چوونکە ئەریستۆکراسییەك، کە باوەڕی راستەقینەی بە لایەنی سرووشتی و مەزهەبی خەسڵەتە بۆماوەییەکانی خۆی هەبێت، ئەو رێز و حورمەتەی کە لە ناو کەسانی دەوروبەریدا ئەهێنێتە ئاراوە، بەو رادەیە، مەزهەبی و سرووشتی دەبێت" "ئێمیل فاگە" نووسیبووی: "شۆڕشی فەرەنسە لە بەر ئەوە رووی دا کە خەڵك خەریك بوو لە برسانا بمرن"، برێگسۆنیش بەم جۆرە وەڵامی دابەوە کە "ئەبێ ئەم

مەسەلە روون بکرێتەوە کە بۆچی خەڵکی تەنها لە هەندێ بارودۆخ دا نایانەوێ لە پەرستنا بمرن؟".

## بەشی یەکەم

# جیا کردنەوەی تێزەکان لە تیۆریەکان

ئەمڕۆکە پێدەچێت سۆسیۆلۆژی، بە تەواوەتی چووبێتە قۆناغی زانستەوە و لەگەڵ ئەوەشدا سەردەمی فارمانێتی سیستەمە گەورەکان و تیۆریە بەربڵاوەکان، کە سەرجەمی ژیانی کۆمەڵایەتییان بەهەڵقولاوی بزاڤ یان، بەرهۆکاری "هۆکارێکی تاقانە" لە قەڵەم ئەدا، جێی خۆی داوە بە سیستمی "دابەش کردنەکانی بەش". ناچارین ئەوە قبوول بکەین کە ژیانی کۆمەڵایەتی، کاتێ کە ئینسان لە قۆناغی خۆ گونجاندن لەگەڵ کۆمەڵگا سەرەتاییەکانەوە تێپەڕی، دەزگایەکی ئاڵۆز کە هەندێ بزاڤی شان بەشانی یەك و هۆکارگەلێکی جۆراوجۆری تیایە. جیا لەوەش، ئەوەمەسەلەی کە یەکێکە لە کێشەکانی زانستی کۆمەڵایەتی، ئەوەیە کە هۆکارە جۆراوجۆرەکان، بە پێی زەمان، یان باروودۆخ و چرکەساتە مێژووییەکان، لێك جیاوازن و کەشوهەوای تایبەت بە خۆیانیان هەیە.

بناغەدانەرانی سۆسیۆلۆژی، لە بەرنەوەی زوو وەرەز دەبوون هەمیشە لە سەنتێزەوە دەستیان پێ دەکرد، بەڵام "ئێمیل لوئنسۆر" لە دەمەتەقێیەکی رەخنەییانەی بە ناوبانگدا بەم دەرەنجامە گەیشتبوو کە "بەڕای من بە فازانجی سۆسیۆلۆگەکانە کە خاکەڕابن".

سۆسیۆلۆژیش، گوێی بۆ قسەکانی ئەو "زەمێریار"ە بەناوبانگە شل کرد. واتە، ڕێگەی بەرەوپێش‌چوونی موحتاتانە، وەصف کردن، شی کردنەوەو راڤەکردنی گرتەبەر.

یەکەم جیاوازییەك کە دەبێ زیاتر لە زانستەکانی تر، بە تەواوەتی لە سۆسیۆلۆژیدا ڕەچاوبکرێت، جیاوازی نێوان تێزو تیۆرییە. تا جاخەکانی

ناوەڕاســت، فەلســەفە بــۆ ڕزگــاربوون لــە داوی سۆســیۆلۆژی، تووشــی گەروگرفتێكــی زۆربــوو، ئــەمڕۆیش فەلســەفە و سیاســەت ئەیانــەوێت سوسیۆلۆژی بكەنە كۆیلەی خۆیان. گرنگایەتی ئاگۆست كۆنت لە دەسنیشان كردنی ئەم پرەنسیبەدا بوو كە، دەبێ بناغەی فیكری هەموو سۆسیۆلۆگێك، بایەخ نەدان بە متافیزیك بێت. ئەمڕۆ دوور ڕاگرتنی سۆسیۆلۆژی لە كاریگەری هەندێ جار ئاشكرا و هەندێ جار نهێنی سیاسەت، كارێكی ئێجگار دژوارە.

بە دڵنیاییەوە ناتوانین ئەوە لە سیاسەت چاوەڕوان بكەین كە تا دروست كردنی زانستێكی هەمەلایەنەی كۆمەڵناسی كە دەرەنجامێكی پراكتیكی حەتمیشی هەبێت، بێكار و دەست لەسەر دەست دابنیشێت (هەڵبەتە ئەگەر توانای بەدی هاتنی وەها زانستێكی كۆمەڵ ناسی قبووڵ بكەین). پراكتیك هەندێ پێداویستی خێرای هەیە و كەوابە، سیاسەت ناچارە خۆی پێش زانستەكان بخات.

لە لایەكی ترەوە، هەروەك وتمان، زۆربەی كات شۆڕشە سیاسییەكان بوونەتە هۆكار، یان هاندەری ئەندیشەگەلی سۆسیۆلۆژیك و هەندێ بزاڤی سەرەكی "فكری" یان لێكەوتۆتەوە.جیالەوەش، لە زانستەكانی تریشدا، دیاردە ناسایییەكان ڕۆڵێكی لەو جۆرە ئەگێڕن؛ بۆ نموونە، مانگگیران (خسوف) و خۆرگیران (كسوف) لە زانستی "هەیئەت"دا و هەروەها نەخۆشییە گشگیرەكان لە بیۆلۆژیدا.

لێرەدا، داگەرانە (گرایش) جۆراوجۆرە سیاسییەكان، لە كەناڵی تێزەكانەوە دەیانەوێ سۆسیۆلۆژی بەرەولای خۆیان ڕابكێشن. هەر تێزێك بریتییە لە كۆی ئەندیشە و بیروڕا شەخسییەكانی خولقێنەرەكەی و ئامرازە زانستییەكانی ئەو تێزەش، تەنها ڕۆڵی ئیستدلالێكی پاساو دەر بە ئەستۆ دەگرێ. بە واتایەكیتر، لەم بارەوە، ڕووداوەكان و ئیستدلالەكان. وەك گوتەبێژییەكی بەرگرانە (تدافعی) ڕێك دەخرێن.

کەواتــە هــەر تیۆرێکــی سۆســیۆلۆژیك، لەبــەرخاتری کــارێکی گــرنگ و بایەخدار هاتۆتە ئاراوەو، بەر لە هەموو شتێك، ئامرازێکە بۆ دانانی یاسا.

بــە پێچــەوانەوە تیۆریــەکان، کــاتێ کــە ڕووداوەکــان پــۆلێن ئەکــەن و لــە ڕێگەی هەندێ بیروڕا و حوکمەوە، لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکارەکانیان ئەکەن و ئەگەر هەندێ ڕووداوی تازەو ناتەبا لەگەڵ ئـەو ڕووداوانــە دا، بێنــە ئــاراوە، لەو کاتەدا قــابیلی پیاچوونەوەن. کەواتــە تیــۆری بــەو هۆیــەوە کــە بــە پێــی پرەنســیپی گشــتاندن و تێکــەڵ کردنــەوە، شــتێکی بەرتەســك و هــەروەها کاتیـیە، بە بەشێکی زانست لە قەڵەم ئەدرێت. هەرچۆنێك بێـت گریمانــەش ڕۆڵێکی لە ئەستۆدایە. واتە بە ئامادەکردنی ڕووداوگەلی قابیلی لێکۆڵینــەوە، بــەهۆی لــێوردبوونــەوە وئەزموونــەوە بــواری پێویســت بــۆ پشــکنین و لێکۆڵینەوە دەرەخسێنن.

## دورکیم (*Durkheim*)

ئێمیل دورکیم یەکێکە لەو کەسانەی کە بـەدەسنیشان کردنـی ئامـانج و پرەنسیبە تایبەتـەکانی سۆسیۆلۆژی، لایـەنی زانستییان پـێبەخشیوە. جیـا لەوەش ئەو، بـەهۆی کاریگەرییـە تاکەکەسییەکانی خۆی، خوێندکارگـەلێکی گەورەی پەروەردە کرد و قوتابخانەیەکی تایبەتی هێنایە ئاراوە کە سـەرەڕای زیـدەڕەوی گـەلێکی "ناچـاری"، دەورێکـی گرنگـی لـە پێشـکەوتنی زانسـتی کۆمەڵ ناسی‌دا بینیوە.

ئاســەوارەکانی دورکــیم، نوێنــەری هــەوڵ و تەقالایــەکی گــەورەن بــۆ تەیارکردنی سۆسیۆلۆژییەکی زانستیانەو بەڕاستی سۆسیۆلۆژیش، بـەر لـەوە زانستییانە نەبوو. ئـەو، بـۆ ئـەم مەبەسـتە، بـەپێی ئـەو ئامانجەی سـەرەوە هەنــــدێ پرەنســـیپی پێویســـتی ڕێـــك خســـت و میتـــۆدی ڕاڤـــەکاری و لێکۆڵینــەوەکانی خـۆی دەسنیشـان کــرد. هەڵبەتــە جــێبــەجێکردنـی ئــەم مەسەلەیە سەخت بوو، چوونکە بەتەنها حـەزکردنی دورکیم بـە تـێڕامانـە فەلسەفییەکان، پێداویستییە زانستییەکانی دابین نەئەکرد. لێرەدا پێویسـتە ئاماژە بە بەشە کاریگەر و بەکەڵکەکانی سۆسیۆلۆژی دورکیم بکەین.

1ـــ **واقعییــەتی کۆمەڵایــەتی**: بەوتــەی دورکــیم، سۆســیۆلۆژی بەرلەهەمووشتێك دەبێ هەندێ پرەنسیبی تایبەت بە خۆی بێنێتە ئاراوە و هەموو مەسەلە ئینسانییەکان بە هەلکەوت نەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. کەواتــە لــە کــاتی لێکۆڵینــەوە کۆمەڵایەتییەکانــدا، ئــەبێ واقعییــەتی کۆمەڵایەتی ئاشکراو ڕوون بکاتەوە.

واقعییەتی کۆمەڵایەتی بەوتەی دورکیم، لایەنی ناوەکی و دەرەکی هەیە و لەراستیدا مرۆڤ ناتوانێت بەوەسفی خۆی بیگۆڕێت. لەم ڕووەوە ئەتوانین بەنیسبەت تاکەوە، بە واقعییەتی دەرەکی لە قەڵەمی بدەین. واقعییەتی کۆمەڵایــەتی لــە راســتیدا خــۆی بەســەر تاکەکانــدا دەســەپێنێت. کەواتــە ئەتوانین بەشێوەی عەینی "وەك شتومەکێك" لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین (شتومەکێك کە بە وتەی دورکیم، دژی ئایدیایەو، پێدەچێت ئەو شتانەی کە ئینسان لە دەرەوە دەیانناسێ پێچەوانەی مەعریفە ناوەکییەکانی بن).

2ــ **جیاوازی نێوان داوەری کردن لەسەر بەهاو داوەری کردن لەسەر واقعییەت**: داوەری کردن لەسەر واقعییەت، دەربڕینی دەسنیشان کردنێکی سادەیە وەك "بەفر سپییە". مەبەست لە داوەری کردن لەسەر "بەها"، هەڵسەنگاندنی بایەخی شتومەکێکە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا کە لە غەیری ئەو حاڵەتەدا، داوەری کردنی لەو جۆرە هیچ مانایەکی نەئەبوو. بۆ نموونە ئەرزشی ئابووری هەموو بەرهەمێك، وابەستەیە بە کڕین و فرۆشتن و هەبوونی بازاڕەوە. ئەرزشی ئاکاریش، هەر بەوجۆرەیە. بۆ نموونە، کاتێك کە ئەڵێن "فلانە کەس، ئینسانێکی باشە"، لەراستیدا چەمکێکی‌ترمان خستۆتەپاڵ ئەو کەسەوە، کەئەو چەمکەش هەڵقوڵاوی ژیانی کۆمەڵایەتییە.

3ــ **زۆرە ملێ**: هەر شتێك کە ببێتە هۆی زۆرەملێ، مەسەلەیەکی تەواو کۆمەڵایەتییە. زۆرەملێ یان پۆزەتیڤە، یان نێگەتیڤ. رەنگە مقاوەمەتێکی نیمە مادی بێت، وەك کاتێك کە بمانەوێت شتێك بە نرخێکی زیاتر لە نرخە ڕاستەقینەکەی بکڕین، یان بفرۆشین (مەسەلەیەك کە نرخ بەندی و سزاکانی پێوەندیدار بە نرخ دانانەوە، هیچ کاریگەرییەکی لەسەر

نەبووبێت، یان لۆمەکردنێکی کەمڕەنگ و تەم و مزاوی بێت، وەك کاتێك کە پێڕەوی لە ڕەفتاری باو ناکەین، یان سزالێکی سەخت، وەك کاتێ کە لە دژی یاساکانی سیتەکان، یان بڕەنسیبە ئاکاریەکان هەنگاو هەڵبگرین.

کەواتە هەموو کەسێك، وەك ئەندامێکی کۆمەڵگا، خاوەنی "جەبر"ێکی لەو جۆرەیە کە لەدەروونیدا بە شێوەی نارەزایی دەروونی، وەڕەزبوون، دڵەڕاوکێی ویژدانی و هەروەها پەشیمانی و.... بوونی هەیە.

4ـ دابەش کردنی کار: دورکیم دایم هەوڵی ئەدا ئەوە پیشان بدات کە چۆن گۆڕانی ژینگەی کۆمەڵایەتی ، شێوە بیرکردنەوەی مرۆڤ بە هەموو شێوەکانیەوە و بە تایبەت مافی کۆمەڵایەتی ــ کە باشترین جۆری بیرکردنەوەیە بۆ راڤەکردنی عەینی ــ دەگۆڕێ.

بە بیروڕای ئادام ئسمیت، دابەش کردنی کار، بناغەی ئابووری پێك ئەهێنێت و بە بڕوای دورکیم، ئاکار و مافیش گرێدراون بە بارودۆخی دابەش کردنی کارەوە. بەگشتی، هێندەی ژمارەی جەماوەر (دورکیم بە تەواوەتی لە چڕیتی جەماوەر (تراکم) بە مانا تایبەتەکەی جیای ئەکاتەوە[80])؛ زیاد بکات، هێندەش دابەش کردنی کار پەرەئەسێنێت و دوای ئەم گۆڕانکاریە، بواری مافی سزادانیش بەرتەسکتر ئەبێتەوە، کە لایەنە تایبەتەکەی، سزادانە بە مەبەستی سەرکوت کردنو، هەروەها بە قازانجی ئەو مافە مەدەنیانەشە کە سزادان بە مەبەستی چاکسازی کردن (اصلاحات) لە تایبەتمەندیەکانێتی.

تا ئێرە هەوڵمان دا بە کورتی ــ بەبێ ئەوەی کە باسی زێدەڕوییەکانی دورکیم سەبارەت بە لۆژیك و داڕشتنی سیستم، بکەین ــ باس لە بڕەنسیبە سەرەکییەکانی سۆسیولۆژی دورکیم بکەین.

لە ڕاستیدا، پەرەپێدانی لەرادەبەدەری تیۆریەکانی سۆسیۆلۆژی، زیانێکی گەورە بەو تیۆریانە دەگەیەنێ. چوونکە، لە سۆسیۆلۆژیدا یاسا گشتییەکان هیچ بایەخێکیان نییە. بۆ نموونە "س.بوگلە[81]" بە کەڵك وەرگرتن لە بڕەنسیبەکانی دورکیم، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئایدیا

یەکسانیخوازەکان، لە ناو گرووپە فرەجەماوەرەکانداو، بە تایبەت لە شارە گەورەکانــدا گەیشــتوونەتە رادەی کــامڵبوون. ئــەوە لــە کاتێکدایــە کــە ئەزموونــەکان ئــەوە دەرئەخــەن کــە ئــەم پرەنســیپە، هەمیشــە راســتی لــەخۆناگرێت و، فرەجــەماوەری (بــۆ نموونــە، لــە بابــل[82] و ئەبــەس[83]ی دێرینداو، هەروەها شارەکانی هیندستان و چین) بە هیچ شێوەیەك نەبوەتە هۆی دامەزرانی رێکخراوگەلی کۆمەڵایەتی یەکسانیخواز.

وەك چۆن لە سۆسیۆلۆژیدا ناتوانین گرنگی بەو پاسانەی بدەین کە قسە لەســەر داگەرانــە سیاســییەکان ئەکــەن، بــەرای مــن تایبەتمەنــدی پاســا سۆســیۆلۆژیکەکانیش ئەوەیــە کــە لــە رووی "کــات و شــوێن"ەوە، بایــەخێکی سنوورداریان هەیە. ئەم پاسانە گرێدراون بە جۆری بیرکردنــەوە و هــەروەها رێکخــراو و پێکهاتــە کۆمەڵایەتییەکانــەوەو، لەگــەڵ ئەوانــەدا ئــەگۆڕدرێن. کەواتــە، پێشــنیار کردنــی پاســا لــە سۆســیۆلۆژیدا، پێویستی بــەم پرســیارانە هەیە: کوێ؟ کەی؟ لە چ بارودۆخێکدا؟

بەشی دووهەم

# ئامانجی ئێستای کۆمەڵناسی

## کۆمەڵناسی ئەنسکلۆپیدیک و زانستە تایبەتە کۆمەڵایەتییەکان[84]

لە رابردووشدا، بە بڕوای بناغەدانەرە سەرەتاییەکانی سۆسیۆلۆژی لە یۆناندا، بیرکردنەوە لە سەر مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان، پێویستی بە زنجیرە زانیاری گەلێکی قووڵ بوو لەسەر مێژوو و ژیانی کۆمەڵگاکان و هەروەها پێویستییەکی زۆری هەبوو بە ئاگاداری سەبارەت بە بیروباوەڕگەلی فەلسەفی و ئەفسانەکان و هەروەها ئایدۆلۆژیا ــ کە کۆمەڵگاکان ئەندێشە و کردەوەکانیان لەگەڵ ئەوانەدا رێک ئەخەن ــ هەروەها بە ئاگابوون لە یاساکان و رێکخراوە سیاسییەکان و ژیانی ئابووری و تەکنیکی. لەم رووەوە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، هەمیشە خۆی لەسەرووی سەرجەم زانیارییەکانی مرۆڤدا داناوە. بۆ نموونە، هەموان دەزانن کە بیرکردنەوە لەسەر زانستە سرووشتی و پزیشکییەکانی سەردەم، تاچەند زەینی مۆنتسکیوی ــ وەك چۆن خۆی لە یاداشتەکانیدا باسی لێوە کردووە ــ بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە. بە هەر حاڵ، ئاگۆست کۆنت، بە پۆلێن کردنی زانستەکان و هەروەها بە هۆی ئاسەوارەکەیەوە بە ناوی "دەرسەکانی فەلسەفەی پۆزێتیف" ئەو مەسەلەیەی پەرەپێدا.

لە لایەکی ترەوە، مێژووی سۆسیۆلۆژی، ئەوە دەرئەخات کە سۆسیۆلۆگی "رەها" بوونی نیە و هەموو سۆسیۆلۆگەکان ناچارن کەڵك لە یەك، یان

چەند زانستێکی تر وەربگرن. کەواتە، سۆسیۆلۆگەکان، یان داوەرن (قاضی) یان ئابووری زان، یان سیکۆلۆژیك، یان پسپۆڕی سرووشت، یان رەگەزناس.

بەڵام ئەو کەسانەش کە ویستوویانە سۆسیۆلۆژییەکی تەواو سەربەخۆ دامەزرێنن، تەنها بەسیستمێکی "ئۆتاسیۆنی جەبری[85]" یان تیۆریگەلێکی رەها و یەگجار کەم بایەخ، وەك تیۆریەکانی "فۆن ویز[86]" کۆتاییان پێهاتووە.

کەواتە، سۆسیۆلۆژی گشتی، ــ بمانەوێت و نەمانەوێت ــ بە وتەی "رێنەووۆرمز[87]" هەمیشە و بە شێوەی بەربڵاو، دەبێ فەلسەفەیەکی زانستی کۆمەڵایەتی بێت. چوونکە سۆسیۆلۆژی گشتی، هەم وەك سەرەتاو هەمیش دەرەنجامی سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتییەکانە. هۆیەکەشی ئەوەیە کە سۆسیۆلۆژی بە وتەی "س.بوگلە" تەنها نەتوانێت چالاکییەکی پلە دووەم بنوێنێت. رۆڵەکەشی تەنها تێکەڵ کردن، گۆڕان و هەڵێنجانی بیروڕا، یان پاساگەلێکی گشتییە کە بەرهەمی زانستەکانی ترن، هێندەی لە توانایدا بێت. کەواتە، سۆسیۆلۆژی ناتوانێت، زانستێکی تەواو رەهابێت. وە ئەرکەکەشی پۆلێن کردنی گشتی و رێکخستنی گریمانە مادییەکان و مەسەلە جۆراوجۆرەکانە، کە تەنها زانستە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکانیتر دەتوانن ئەو کەرەسە پێویستانەی بۆ فەراهەم بکات. هەر جۆرە بەرداشتێکیتر لە سۆسیۆلۆژی، یان ئەمگۆڕێت بە سیستمی ئۆتاسیۆن، یان بە جۆرە بیرکردنەوەیەك کە هیچ واقعییەتێکی تێدا نەبێت. واتە "تیۆرسازی" و "خەیاڵ چنی رەها". هەنووکەش، سەرەڕای هەموو ئیحتیاتێك، سۆسیۆلۆژی بە تەواوەتی رووی لە خەیاڵ چنی کردووە.

## ئیجاز و بەراوردکردنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان

دورکەیم لە ناسەوارەکەیدا بە ناوی "داب و نەریت" دەڵێ: هیچ سۆسیۆلۆگێك ناتوانێت بە شێوەی مادی، زانیارییەکی تەواو لەسەرجەم زانستەتایبەتە کۆمەڵایەتییەکان بە دەست بهێنێت. هەر ئەم مەسەلەیە کۆسپێکی گەورەیە لە بەردەم پێشکەوتنەتازەکانی ئەم زانستەدا. کەواتە

سۆسیۆلۆژی سەرەڕای گیروگرفتەکانی، نابێ لە ئەرکەکەی خۆی ــ کە بریتییە لە "ئیجاز" و کەڵك وەرگرتن لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانیتر و هەروەها کەڵك وەرگرتن لە گریمانەکان، پشکنینەکان و دەستکەوتەکانیان ــ لابدات. هەروەها بناغەی پرەنسیبە سۆسیۆلۆژیکەکان "بەراوردکردنی" کۆمەڵگاکان و رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانە.

## میتۆدە ئۆبژێکتیڤە[88] مەخرووتییەکان

ئەم پرەنسیبانە بریتیین لە کۆنترۆڵ کردنی لێکدانەوەو راڤەکارییەکانمان بە پێی پاساگەلی راڤەکارانەی "عەینی مەخرووتی". بۆ نموونە سەبارەت بە دیاردەی جەنگ، بەم جۆرە ئەنجام ئەدرێت.

1ــ بەر لە هەموو شت وێناکردنێکی دەرەکی رەها و سادە، لە بەرانبەر پرسیاری "چ شتێك رووی داوە؟" یان "چۆن دەتوانین جەنگ بناسین؟" کەبە پێی توانا، نامارێکیشی پێ زیاد ئەکرێت. لەم حاڵەتەدا دەتوانین لایەنە سەرەکییەکانی جەنگ، بە پێی فۆرمە جۆراوجۆرەکانییەوە دەستنیشان بکەین.

2ــ لە پلەی دووهەمدا، ئۆبژێکتیڤ کەم ئەبێتەوەو، دەبێ توخمە پسیکۆلۆژیکەکانی تێوەربدەین. واتە دەبێ هەموو ئەو راڤەکاری و هاندەرانەی کەدەس پێکەرانی جەنگ ــ واتە ئەو کەسانەی کە هۆی دەس پێکردنی شەڕن ــ لە بەر چاویان ئەگرن، لێك بدەینەوە و پۆلێنیان بکەین.

3ــ پاشان دەبێ لێکۆڵینەوە لەسەر راڤەکارییەکورتەکان بکەین، واتەلێکدانەوەی ئەندیشەی تیۆرسیەنە سیاسییەکان و مێژوونوسان و ئابووری زانان و.... هەروەها سەبارەت بە شەڕە جەکدارییە جۆراوجۆرەکان، یان یەکێك لە فۆرمە تایبەتەکانی جەنگ.

4ــ لە ئاکامدا ئاوڕ لە تێزە گشتییەکانی ئەم بوارە بدەین، وەك تێزەکانی تیۆلۆژیست و فەیلەسووف و مۆراڵیستەکان.

هەموو ئەم ئەندیشە و داوەری کردنانە، لای سۆسیۆلۆگ، مەسەلەگەلێکی قابیلی تێڕامانن کە ئەبێ بە شێوەی عەینی لێکۆڵینەوەیان لە سەربکرێت.

چوونکە گرنگییان لەوەدایە کە، لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، ئەندیشە بنەڕەتییەکان ــ چ راست بن، یان خەیاڵی ــ بەش بە حاڵی خۆیان کاریگەری لەسەر واقعییەت دادەنێن. چوونکە حەتمەن لە ناو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆیان دەرئەخەن.

قازانجی ئەم رەوشە، واتە دروست کردنی ئاسۆیەکی تەواو لە بەردەم ئەو دیاردەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێ، ئەوەیە کە سەرەتا دیاردەی ناوبراو سنووردارو دەستنیشان دەکاو هەروەها شێوازی پێکهێنەرانی ئەو دیاردەیە و چۆنیەتی ئیستدلالەکانیان سەبارەت بە کردەوەکانی خۆیان دەستنیشان ئەکات. جیا لەوەش، رەچاوکردنی هەموو تیۆرگەلی پێوەندیدار بەمەسەلەکەوە نایەڵێ تاکەکان لە رووی بێ ئاگاییەوە، بە رێگە کۆن و بێکەڵکەکاندا بچن.

لێرەدا دوای وێناکردن و پیاچوونەوەی بەرلیی، رەنگە لە رووی زانستییەوە لێکۆڵینەوە لەسەر دیاردەیەك بکەین و لەو کاتەدایە کە ئەتوانین دەست بکەین بە شیکردنەوە و دابەش کردنی و هەوڵ بدەین پێوەندییەکان بدۆزینەوە.

## رەگەزناسی و رێکخراوە کۆمەڵایەتییە سەرەتاییەکان

لایەنی سەرنج راکێشی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، ئەوەیە کە پێدەچێت رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیان، وەك رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی بەرلەمێژووی کۆمەڵگا شارستانییەکان بن. بەڵام ئەوە تەنها تەسەور کردنێکە و هیچیتر، چوونکە ئەگەرێکی زۆر لە ئارادایە کەخەڵکانی بەراییەکانی ئەم سەردەمە، یان بەلانی کەمەوە هەندێکیان، پاشماوەی ئەو شارستانییەتانەن کە بە هۆی رووداوە مێژووییەکانەوە هەڵوەشاونەتەوە. بۆ نموونە "میزۆپۆتامیا" دوای هێرشی مەغۆلەکان، گۆڕا بە بیابانێك کە تەنها چەند خێڵێکی دەوارنشینی تیا دەژیا. هەروەها ئەو ناوچانەی کە تووشی "مەلاریا"، یان نەخۆشی خەو بوون، دوچاری هەمان چارەنووس بوون. لە لایەکەوە شارستانییەتە سەرەتاییەکان، بە ئەگەرێکی زۆرەوە بناغەگەلی

جۆراوجۆریان هەبووە، کەواتە هیچ ویکچوونێکیان نەبوو. بۆ نموونە، لە سەردەمی مێژوودا، هەندێ لە شارستانییەتەکان هیچ پێوەندییەکیان بە یەکەوە نەبووە و کەچی گەشەیان کردووە (وەك ئەمریکای پێش کریستۆف کلۆمب، لەبەرانبەر کیشوەری کۆندا). یان وەك شارستانییەتی چین و شارستانیەتی یۆنانی — رۆمی خۆرئاوا، پێوەندییەکی یەکجار کەمیان لە گەڵ یەکدیدا هەبووە.

جیا لەوەش، ئەندیشەکان و رێکخراوگەلی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، وەك پێویست سادە و ساکارنین و بە تایبەت بۆ نموونە، بیروڕاکانیان سەبارەت بە پێوەندییە بنەماڵەییەکان وەك بیروڕاکانی ئێمە ئاڵۆزن. ئەم مەسەلانە دەرەنجامێکی سادەیان هەیەو رێورەسمگەلی جۆراوجۆر، داب و نەریت و هەروەها هۆکارگەلی خەیاڵی و جادوو، کە فۆلکلۆر رۆژبەرۆژ ئاشکراتر و روونتریان دەکا، بەفراوانی تیایاندا بوونی هەیە.

## پێکادان و شێوەکانی تێپەڕین

بەلاَم سۆسیۆلۆژییە گشتییەکان دەبێ زیاتر گرنگی بەکام یەك لەو مەسەلە و زانیارییە زۆرانەی بدەن کە بە هۆی زانستە تایبەتەکانەوە جڕ (متراکم) بوونەتەوە؟ وەك بینیمان، یەکێك لە بە کەڵکترین کردەوەکانی سۆسیۆلۆژی گشتی، سەرپەنەوەدی پێکادانی (تلاقی) نێوان ئەو زانستانەیە کە هەڵقوڵاوی پسپۆڕیبوونی "تەرتیبات" و دۆزینەرەکانیانەوە. بۆ زیاتر کردنی ئەم رۆڵە بەراوردکارانە و لێکدراوانەیە (قیاسی و ترکیبی) دەبێ زیاتر گرنگی بە رێکەوتن و لێك تێکەڵ بوونی (توافق و تداخل) زانستە تایبەتەکان بدات و کاریگەرێتی دوولایەنەی ئەو دیاردانە بدۆزێتەوە کە هەر زانستێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەکات. بۆ نموونە ئەبێ دەرك بەوە بکات کە چۆن باوەڕە مەزهەبییەکان، کاریگەری لەسەر زاوزێ و وەچەخستنەوە، یان ئابووری دادەنێن و هەروەها چۆن زانستی پزیشکی، کاریگەری لەسەر هاوسەنگێتی جەماوەر و مەسەلە ئابوورییە

کاریگەرەکان دادەنێ‌و هەروەها چۆن مافەکۆمەلایەتییەکان، کاریگەری لەسەر سیستمی ئابووری دائەنێن و پێچەوانەکەشی.

هەروەها، بە پێی مێژووی کۆمەڵگاکان و رێکخراوە کۆمەلایەتییەکان، دەبێ سۆسیۆلۆژی گشتی، گرنگییەکی تایبەت بە شێوەکانی تێپەرین بدات. لای هەموو ئەو کەسانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی، بەبێ سەرنج دان بە رووداوە پرکارەسات، یان خلاقێنەرەکانی، لە بەرچاو ئەگرن، قوناغە جۆراوجۆرەکانی مێژوو بە شێوەی زنجیرەیەك "چاخی زەوی ناسی" کە جیاوازیشیان لەگەڵ یەکدیدا هەیە، دەرنەکەوێ. بەلام تێپەرینی ئەو چاخانە زۆر بە ئارامی و هێدی تێدەپەرن و لەبەردەم ئەو تێپەرینانەشدا، هەندێ رەوت کاریگەرییان هەبوە کە هەڵقولاوی دڵەراوکێ و بێ ئەزموونی، لاسایی کردنەوە، کەڵك وەرگرتن لەوانی تر و هەروەها توانەوەگەلی گەورە و.... بوونە. دەبێ دۆزینەوەی شێوە راستەقینەکانی ئەم قوناغگەلی تێپەرینە، یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی سۆسیۆلۆژی دینامیك بێت.

بە گشتی ئەتوانین بڵێین کە ئەمرۆ هەموان لەسەر دەس‌نیشان کردنی ئامانجی سەرەکی سۆسیۆلۆژی هاوبیروران. ئەم ئامانجە بریتییە لە:

ئەلف: "لێکۆڵینەوەی سیستمی کۆمەڵگاکان" و توخمگەلی پێك هێنەری کۆمەڵگاکان و کردەکانیان.

ب:لێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلانەی کە لە گۆرانی رێکخراوە کۆمەلایەتییەکاندا دەوریان هەبووە.

ج:رووبەروو کردنەوەی دەرەنجامەکانی زانستە کۆمەلایەتییە تایبەتەکان (وەئەمەش بوار بۆ "فەلسەفەی زانستی کۆمەلایەتی دەرەخسێنێ.)

د: لێکۆڵینەوەی پێوەندیگەلی نێوان کۆمەڵگاکان و سیستمی فکری ئەو تاکانەی پێکیان هێناون (ئەمە ئەرکی پسیکۆلۆژی کۆمەلایەتییە).

هـ: لێکۆڵینەوەی ئەو هۆکارانەی کە لە گۆرانی سیستمی کۆمەڵگاکاندا دەوریان هەیە.

بەشی سێهەم

# کۆمەڵناسی ئستاتیک89

دابەش کردنی سۆسیۆلۆژی بە ئستاتیک و دینامیک، وەك بینیمان لەلایەن ئاگۆست کۆنتەوە پێشنیارکرا. سۆسیۆلۆژی ئستاتیک ئەبێ کۆمەڵگاکان لە حاڵەتی ئارامش و لە چرکەساتێکی دیاریکراودا ــ بەوتەی کۆنت، لە "شوێن"دا ــ بخاتە بەر لێکۆڵینەوە. دینامیکیش لە "زەمان" دا کۆمەڵگاکان دەخاتەبەر لێکۆڵینەوەو، گۆڕانکارییەکان و هەڵوەشانەوەکانیان شیئەکاتەوەو هۆکارەکانیشی دەسنیشان دەکا.

**هۆکاری زەمان: ریتم[90]، دەورە، قۆناغ**

سۆسیۆلۆژی ئستاتیك تەنها دەتوانێ "سەقامگیرییەکی رێژەیی" لە بەرچاو بگرێت. چوونکە ژیانی کۆمەڵگاکان پێکهاتەیەکە لە زنجیرە بزاڤگەلێکی نایەکسان، کە لە زۆر ڕووەوە پێکادانیان ئەبێت.

بەرهەم هێنانی ئابووری، ئاڵوگۆڕکردنەکان، ژیانی کاتی، داب و نەریت، ژیانی سیاسی، مەزهەبی و.... بریتییە لە دووپات بوونەوەی ڕێکوپێکی دەورەکان و هەموو ئەم دیاردانەش، بەردەوام لە ماوەی زەماندا دەگەڕێنەوەو، دوابەدوای یەکدا هاتنی ئەو دیاردانە، یەکێکە لە توخمە پێکهێنەرەکانی سیستمی کۆمەڵگاکان. وەك دەبینین، لایەنی دیاریکراوی ژیانی ئابووری، ئەو سەردەمانەیەکە مەسەلەی بەرهەم هێنانی کشت و کاڵ، لە "چاندن"ەوە تا "درووێنەکردن" ڕێك ئەخەن.

دیاردە سەردەمییەکانی تریش، وەك ئەو قەیرانە دوابەدوای یەکانەی کە هەڵقوڵاوی بەرهەم هێنانی لە ڕادەبەدەرو دابەزینی نرخەکانن، کە لە هەمان کاتدا، کەمتر ناسراون، ماوەیەکی زۆریان خایاندووەو کاریگەری ئەکەنە سەر هەموو لایەنەکانی تریش. هەروەها لەم مەسەلەیەدا ئەبێ

بزاوتـه درێژخایەنـەکانیش (Secular Trend) کـە دەخرێنـە پـاڵ هۆکارەکانیتر، لەبەرچاو بگرین.

## گرنگایەتی کۆمەڵناسی

گومـان لەوەدانییـە کـە لەگـەڵ پێشکەوتنی روولـەزیادبوونی (تصاعدی) زانسـتە مادییـەکان، پەرەسـەندنی جـەماوەر و پێشـکەوتنی ئاسـتی فکـری کۆمەڵایەتی خەڵکی و هەروەها پێویست بوون و گرنگایـەتی سۆسیۆلۆژیش رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێ. دابـەش کردنـی دادپەروەرانـەی سامانو، رێگرتن لـە زێدەڕەوییە کۆمەڵایەتییەکان و جەنگەکان و باشتربوونی دۆخـی فەرهەنگی گشتی، پێویستی بـە زنجیرە زانیـاری و ئیستدلال گـەلێك هەیـە، کـە تـەنها سۆسیۆلۆژییەك دەتوانێ دابینیان بکات کە لە سەربناغەی جیهان بینییـەکی ئیستدلالی راوەستابێت و هەروەها پشتی بە هەندێ پرەنسیبی ئـەزموونی و پێشکەوتووەوە بەستبێت.

مرۆڤ ئێستا پێویستی بەوە هەیە کـە زانسـتە جۆراوجۆرەکـانی خـۆی، کـە هەر کامیـان لـە بوارێکدا گەیشتوونەتە پلەیـەکی کامڵبوون و، هەنـدێکیان بـەهۆی خـراپ کـەڵك وەرگرتنـەوە ــــ بـەرهۆکاری تایبەتمەندییـە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان ــ بوونەتە ئامرازێك بۆ سووکایەتی پێکردن و درێژە پێدانی کۆیلەتی مرۆڤ پۆلێن بکات و، بـە روونـاکبینی و بەهارمەتی بیروڕا پێشرەوو رێك خەرەکان، زانیارییەکانی خـۆی بـە قازانجی مرۆڤایەتی بـەکار بهێنێت. بەدڵنیاییـەوە سۆسیۆلۆژی بەپشت بەسـتن بـەو پرەنسیبانەی کـە لـە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا بـە باشـترین شـێوە خۆیـان دەرخسـتووە، گرنگییـەکی ڕاسـتەقینە بەدەسـت نـەهێنێت. وەك دەزانـین جیهـانی کـۆن و روو لـە دارمـان و هەڵوەشـانەوە، وەك چـۆن بەمەبەسـتی داپۆشینی لەرزۆکی و دارزیـوی بونیاتەکـەی و هـەروەها پاساو هێنانـەوە بـۆ فرەخوازی و کردەوە درندانەکانی خۆی، کەڵك لە زانستەکانیتر وەردەگرێ؛ بـەوجۆرەش دەیـەوێ بەمەبەسـتی پاراسـتنی بارودۆخـە کۆمەڵایەتییەکـەی خـۆی و پاکانـەکردن بـۆ جەنگـەکان و ئاسـایی پیشـاندانی قەیرانـەکان و هـەروەها گوشـار و جیـاوازی رەگـەزی و ئـابووری، کـەڵك لـە سۆسـیۆلۆژی وەربگرێـت و پاشـان هـەموو گۆڕانکارییـە مێژووییەکانیش بخاتـە ئەسـتۆی

"هەڵکەوت" و ئاینـدەی مـرۆڤیش تـەم و مـژاوی و بەرتەسـك و ترسـناك پیشـان بـدات. دیـارە ئـەم هـەوڵ و تەقەلایانـە، کـە لـە داروینیـزم، میـژوو، کۆمەڵ ناسـی و سـیکۆلۆژی و..... نموونـەیان زۆرە، هـیچ زیانێـك لـە زانست ناگـەیەنن و لـە هـەمان کاتیشـدا، رێ لـە هەڵوەشـانەوەی جیهـانی تاوانبـار و داڕزیوی فرەخوازان و ئەوانەی دەیانەوێ زانست نابووت بکەن، ناگرێت.

## پەراوێزەکان

1. مەبەست لە سیتە، شار، یان وڵاتێکە کە خاوەنی رێکخراوگەلی کۆمەڵایەتیو هەروەها کەلتووری تایبەت بە خۆی بێت.

2. یاسا: بەرگی دووهەم

3. خاوەن سەروەتو سامانەکان

4. سیاسەت: بەرگی یەکەم.

5. ناوی دێرینی گەلی فەرەنسە

6. deuteronome. دوایین کتێب لە پێنج کتێبەکەی مووسا.

7. alaric- پاشای ویزیگوتەکان بوو کە هێرشی کردە سەر رۆژهەڵاتو رۆمای قەڵاچۆ کردو ساڵی 410 کۆچی دوایی کرد.

8. دۆکترینی ئۆمانیستەکانی رێنسانس کە گرنگی تایبەتیان ئەدا بە زمانو ئەدەبیاتی دێرین.

9. کۆمەڵە هۆنراوەی حەماسیو کۆمیک، نووسینی ئاریۆست(1516).

10. شاکاری سێروانتس، گەورە نووسەری ئیسپانیایی.

11. پیەرئارتین(aretin) – ساتیرنووسی بەناوبانگی ئیتاڵی، کە پیاوێکی ملهۆڕو شەڕەنگێزو لە هەمان کاتیشدا خاوەن زەوقێکی باشی هونەری بوو(1555-1492).

12. boccace- نووسەری گەورەی ئیتاڵیو خاوەنی کتێبی دیکامرۆن.

13. خێڵێکی گەورەو بەهێزبوون کە لە باکووری رۆژهەڵاتی یۆناندا واتە دراتیک، دەژیان.

14. ریفۆرم یان ریفۆرماسیۆن، ناوی بزووتنەوەی ئاینیو سیاسی سەدەی شانزدەهەمی زایینییە کە یەکبوونی کاتۆلیکی لەناوبردو زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای لە ژێر دەسەڵاتی پاپدا هێنایە دەرەوە.

15 له مەسێحییەتدا مەبەست لە یەکەمین تاوانی ئادەمە، واتە ،خواردنی میوەی قەدەغەکراو، کە هەندێ کەس بە بەڵگەیەکی لە قەڵەم ئەدەن بۆ لەچارەسەر نەهاتنی مرۆڤ و دەرمانی حەتمیشی.

16- زۆربەی مێژوو نووسەکان لەوباوەڕەدان کە گرنگیدانی زیاتر بە بەرگری کردن، وەك بە هێرش کردن، دەبێتە هۆی پارچەپارچە بوونی سیاسی [ دەوڵەتەکان].

17- واتە، تاکەکانی مرۆڤ گورگی یەکدین [ بۆ یەکتری وەك گورگ وان].

18- ناوێکە لەسەر سەرجەم میتۆدی دێکارتدا دانراوە و ئەم رستەیەی خۆیدا جەر دەبێتەوە کە «بۆ گەیشتن بە حەقیقەت دەبێ هەموو بیرۆکەکانت فرێ بدەیتو سەرلەنوێ بناغەی زانیارییەکانت دەبەمزرێنیتەوە».

19- Quetelet (jacques) -ماتماتیکزان و زمیرپاری بەلژیکی(1796-1874).

20- خوناسی و سیاسەت

lock—21

Qoung 22

Mandville -23

physiocrate -24

Quesnay 25

jeremi Bentham -26

27- Atomisme ـ سیستمێکی فەلسەفییە کە پێی وایە جیهان بەهۆی پێکدادانی هەڵکەوتانەی ئەتۆمەکانەوە هاتۆتە ئاراوە.

28-خاڵی بەرانبەری دارمانی سەرەتایی (واتە یەکەمین تاوان).

29- کتێبی یەکەمی تەورات

30- واتە، شکڵێکی حەلەزوونی.

31- پێویستە بوترێت کە نسبەرالی سادەی حەڵقەپێچی(مارپێچی)هەمیشە بریتییە لەدووبارە بوونەوەی قۆناغگەلی وێکچووبەلام پیشاندانی ماتماتیکییانەی

تەكامولێكی پێشكەوتوو و بەرفراوان و بێ كۆتایی بەرای لایب نیتزبە هۆی نسپیرالی « تصاعدي »یەوە ئەنجام دەدرێت كە رێكخەری تەكامولی بوونەوەرە زیندووەكانە.

32- واتەرەگەزناسی بە پێی تایبەتمەندییە جەستەیی و سروشتییەكانەوە.

33- تغیيرات لسانی

34- ئیدیۆم

35- روح القوانين

36- تفكيك قوا

37- بەپێی ئەم پرەنسیبە زەوییە كشت و كاڵییەكان بەهۆی لەڕادە بەدەر كەڵك لێ وەرگرتنیانەوەتواناى خۆیان لە دەست ئەدەن و دەبنە هۆی كەمبوونەوەی بەرهەمی رەنجی ئینسانەكانو پێدەچێت هیچ رێگایەكیشی نەبێت.بەڵام ماركس ئەم باوەڕەی رەت كردۆتەوەو بە پشت بەستن بە داهێنانە مۆدێرنەكانی زانستە سروشتیوكشتو كاڵییەكانو(Engrais_ و_) و رەوشە جۆراوجۆرەكان وەبەرهێنانی زەویو ... هتد، ئەو باوەڕەی بە نادروست زانیوە.

De Stael -38

Dirigisme -39 ـ بەرێوە بردنو كۆنترۆڵ كردنی توندی كاروبارە ئابووریە یان سیاسییەكان .

Protectionnisme -40 ـ پرۆتكسیۆنیستەكان كەسانێكن كە دەیانەوێ بە دەستنیشانكردنی نرخ گەلێكی زیاتر بو كالاّ گەلی بیانی، وا لە بازارە ناوخۆییەكان بكەن كە تەنها كالاگەلی بەرهەم هێنراوی ناوخۆیی خۆیان تیا بفرۆشرێت. نرخ گەلی ناوبراو، كە بە مەبەستی گران كردن و بێ رەونەق كردنی كالاّ بیانییەكان دەستنیشان دەكرێ، بە قازانجی خاوەن كارەكان و بە زیانی مەسرەفكەران دەكەوێتەوە. لە كاتێكدا لیبراڵیزم و بازرگانی ئازاد، تەواو پێچەوانەیەو داكۆكی لە پێوەندی گەلی بازرگانی و رەقابەتی ئازاد دەكات. ئەڵبەتە هەردوو ئەم تێزانە، كەم وكوڕی زوریان تیایە و هیچكامیان بە قازانجی مەسرەفكەران نین .

41- فرێدریش لیست(1746Listet 1789)لەگەڵ ئەوشدا بناغەدانەری ناسیۆنالیزمی ئابوورییە.

42- Gobineau

43- لە ڕاستیدا تیۆرە گۆبینیەکانیش بە هۆی ئۆپۆرتۆنیسمی ئەڵمانییەوە بە دروستی رەچاو نەدەکران. بە مەبەستی بەتەواوەتی جێبەجێ کردنی ئەم تیۆرانە، دەبوایا کەلك لە ئەندازەگەری جەستەیی وەربگیردرێت ، لە کاتێکدا نازیەکان تەنها لایەنە کۆمەڵایەتییەکان، یان ئەتەوە یان مەزهەبیان رەچاو دەکرد، کە بە تەواوەتی دوور لە وردەکارییە زانستییەکان . جیا لەوەش خۆدی هیتلەر رەنگی پێستی گەنمی بوو، هەروەها کەللەسەریشی خرت (Brachycepkal) بوو ( کەواتە بە پێی باوەڕی خۆیان سەر بە رەگەزی پەست بوو، ) هەر ئەم مەسەلەیە ڕێگربوو لە بەردەم بەڕێوە بردنی سیستماتیکی دوکترەینی نازیسمدا.

44- بەشێکە لە لیدوانی پەرلەمانتارێك بە ناوی ئینسارلە یەکێك لەدوو ئەنجومەنەکانی پاش شۆڕشی فەرەنسە.

45-Cosmopxlitism ــ گوێ نەدان بەنەتەوە و نەتەوایەتی(جیهان نیشتمانی).

46-بڕوانە فەسڵی دووهەمی هەر ئەم کتێبە «مارکس و ماتریالیزمی مێژوویی ».

47- Legitimisme ـ لایەنگرانی پاشایەتی بۆماوەیی

48- شایانی باسە ئەوانەی کە موبالەغە(زێدەڕەوی) لەراست و دروست بوونی وشەکاندا دەکەن ڕەخنەی زۆریان لە وشەی سۆسیۆلۆژی گرتووە،چوونکە وشەی ناوبراوبلەڕیشەیەکی لاتینی و ریشەیەکی یۆنانییەوە وەرگیراوە.

49- قوانین مراحل ثلاثه

50- Positvisme فەلسەفەی تایبەتی ئاگوست کۆنت کە پێی وایە حەقیقەت تەنها لەرێگەی تێڕامان و ئەزموونەوە قابیلی دەرك کردنە.

51-On liberty

52- مارکس لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی «بنەماڵەی پیرۆز» باسی نووسەرانی سەدەی هەژدەی فەرەنسە دەکات کە بەڕای ئەو، بناغەدانەرانی

ماتریـــالیزمن، لەوانـــە هلۆســـیۆس، دیـــدرۆ، هۆلبـــاخ. هـــەروەها بەلـــەحنێکی لایەنگرانـــەوە باســـی بـــابۆف و بلانکـــە دەکـــات بـــەلام بەوەرگـــەل و بـــیرورا سازشکارەکانیان سەبارەت بە خەسڵەتەکانی کەمینە کاریگەرو ڕێبەریکەرەکان بە تەواوەتی پشتگوێ دەخات.

53- Tao بناغەدانەری تائۆئیسم. ئاینی بەناوبانگی چینی

54- گۆڕانکاری هێدی هێدی و لە سەرخۆی ئاشتی ئامێزانە

55- Finalite– دوائامانجی حەتمی

56- تەنها نیچە تاڕادەیەك روونکردنەوەی لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە و وەك چۆن رەخنـەی لـە مەسـێحییەت گرتووەرەخنـەی لەرۆحییـەی وەفاداری و ملکەچ بوونی لەڕادەبـەدەری ئەڵمانییـەکانیش گرتـووە.هـەروەها بـە مەبەسـتی تـێ گـەیشتن لەئاکار و جۆری بیرکردنەوەی نیچە دەبێ ئەوە بـزانین کەفەلسەفەکەی ئـەو تـا ڕادەیـەك خەسـڵەتەکانی فەرەبوودەکاتـەوە.چـوونکە تیۆرسـیەنی "گـەورەپیاو" نـەك تـەنها تیپێکـی پـاخی و سـەرکێش نەبووبەڵکوولـەرووی جەستەییەوە لاوازونەخۆش وشەرمن و یەکجاریش پابەندبوو.

57- Woxweiler

58- Westermark

59- cidding

60- cooly

61- small

62- Mac Dougall

63- کە ئەویش رەوانترین ماڵی خەڵکە

64- Pareto

65- Caray

66- کۆبوونەوەی هاوکاتی دوو رەهەندی دژ بەیەك

67- C.Gini:path ologia economca

68- Dolichocephal_ کەللەسەری درێژ

69. Brachycephal ـ کەللەسەری خڕت

70. Ammon

71. Sorocin

72. Galton

73. Macquray

74- خێڵەکانی ئەفریقای باکوور کەنابێ لەگەڵ عەرەبەکاندا بە هەڵەیان بگرین.

75. Jams Frazer

76. J.Louis Brahl

77. J.Sorel

78 Bergson

79- شۆڕشی مەزنی فەرەنسە

80- رادەی تەراکوم بەپێی ژمارەی جەماوەر تەنها رادەی جەماوەر دەس نیشان دەکا لە رووی چەندایەتییەوەبەلام تەراکومی کۆمەلایەتی پانتای پێوەندییە کۆمەلایەتی و مادی و فیکرییەکان دەس نیشان دەکاوکەواتە رادەیەکی چۆنایەتییە.

81. Bougle

82. Babel

83. Thebes- سیتەی یەکجار گەورەی میسری دێرین.

84- ئابوری، زانستە سروشتیەکان، مرۆڤ ناسی، مێژوو......

85- هێمادانان

86. Von Wiese

87. Rene Worms

88- بینینی عەینی

89. Statique- نەگۆڕو هاوسەنگ

90. Rythme- گۆڕانکاری وهەڵبەزین ودابەزینی رێکوپێک و سیستماتیک

## بۆئاگاداری زیاتر:

ئادام ئسمیت (1723-1790ز): کتێبی "سامانی نەتەوەکان"ی نووسیوە کە نەتەنها بناغەی زانستی تازەی ئابوورییەت (اقتصادیات)ی دامەزراند، بەڵکوو ئەندیشەی ئینگلیزیشی لە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان دوورخستەوە و سەرقاڵی تیۆری و پرەنسیبە ئابوورییەکانی کرد.

ئاشیل(Achille)یەکێکە لە خوادایانی یۆنان، کوری تەنیس و پێلە و بە ناوبانگترین قارەمانی یۆنان لە چیرۆکی ئیلیاد دا. هێکتۆری کوشت و لە ئاکامدا خۆیشی بەدەستی پاریس (paris) کە تیرێکی لە پاژنەی پێی دا، کوژرا.

ئاگۆست کۆنت (Aoguste conte)؛لێکۆڵینەوەکانی هێندە قووڵ و بەرفراوان بوون کە تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندە گەورەکانیش لە پۆلەکانیدا حازر دەبوون. کۆنت بناغەدانەری قوتابخانەی پۆزیتیویسمە. گرنگترین بەرهەمیشی "دەورەی فەلسەفەی پۆزیتیویستی"یە. لە دوایین ساڵەکانی تەمەنیشیدا قوتابخانەیەک بە ناوی "ئایین خوازی ئینسانی" هێنایە ئاراوە کە تاقێمکی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە.

ئاگۆستین (Saint augustine)لەشەی شاری هیپۆن لە نزیک شاری بۆن (354-430) لەسەردەمی لاوێتیدا بە هۆی ئامۆژگارییەکانی "سنت ئامبروو

ناز"موە هاتە سەر ڕێگای ڕاست و (لە ڕووی ناکاریەوە) بوو بە یەکێك لە گەورەترین قەشەکانی کڵێسا. نووسینە گرنگەکانی بریتین لە شاری خوا، دان پێدانان و.....

ئیبنی خەلدوون،عەبدوڕەحمان کوڕی محەمەد (1332-1406ز) گرینگترین کتێبی بریتییە لە "کتاب العبرو دیوان المبتدأ و الخبر في ایام العرب و العجم و البربر.."

ئەسپێنسەر (Herbert spencer)گەورەترین کۆمەڵ ناسی بەریتانیایە و بۆ ماوەی نیوسەدە ئەندیشەی کۆمەڵایەتی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە (1903-1820ز) سی ساڵ لە تەمەنی خۆی تەرخان کرد بۆ نووسینی کتێبی سێبەرگی "پرەنسیپەکانی کۆمەڵناسی".

ئەسپینۆزا(spinoza)گرنگییەکی یەگجار زۆری بە عەقڵی ئینسان ئەداو ئەنانەت لەگەڵ عەقڵی بێپایانی خوا بەراوردی دەکرد و پێیوابوو عەقل ناهێڵێت دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی میکانیکی کارەکانی ئەنجام بدات.

ئەرەستوو (Aristoteles)زانای بە ناوبانگی یۆنانی (384-322پ.ز) باوکی پزیشکی پاشای مەقدوونییە بوو. بە منداڵی باوکی مردو ئەویش چوو بۆ ئەسینا و لە پۆلەکانی ئەفلاتووندا خەریکی خوێندن بوو. گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە: "هونەری شێعر"، "هونەری گوتە بێژی"، "کتێبی ناکار"، "سیاسەت" و "میتافیزیك".

ئەریستۆفان (Aristophan)بەناوبانگترین شاعیری کۆمێدی ئەسینا (445-386پ.ز) یازدە کۆمێدییەکەی تێزیە لە ڕەخنەگرتن لە ئەبارە سیاسی و ئەدەبییەکانی. "هەورەکان"، "باڵندەکان"، "بۆقەکان" لە بەرهەمەکانین.

ئیبنی بەتووتە،گەڕیدەی عەرەب. ساڵی 1304 لە دایك بووە و ساڵی 1378ی کۆچی، کۆچی دوایی کردوە. کتێبێکی لێ بەجێماوە بە ناوی "تحفة النظار في غرائب الامصار و عجائب الاسفار"

به وتنەوەی فەلسەفە. سالی 1918 بوو بە ئەندامی ئەکادیمی فەرەنساو لەوە بەدواوە دەستی لە وانەوتنەوە کێشاو چووە نێو سیاسەت و کاروبارە نێودەوڵەتییەکانەوە. گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە: دوو سەرچاوەی ئاکارو ئایین، مادە و حافیزە....

بۆقرات‌سالی 460پ.ز لە دوورگەی "کوس" دا لە دایك بووە. سالی مردنیشی زۆر روون نییە بەلام پێدەچێت نزیکەی سالی 377پ.ز کۆچی دوایی کردبێت.

بوودن (Budan)شێوەکاری فەرەنسی (1824-1898) یەکێکە لە پێشەنگەکانی ئەمپرسیۆنسیم.

بووکاچیۆ (Boccacio)نووسەری ئیتالی (1313-1375) نووسەری کتێبی "دێکامرۆن". یەکەمین پەخشان نووسی ئیتالیایە.

پرۆدۆن (prouadhon)ئەو کۆمەڵناسانەیە، کاتێ کە دەرك بەسەرچاوەی مێژوویی هەندێ لە دیاردە ئابوورییەکان ناکەن، بە پشت بەستن بە تۆستوورەکانەوە روونکردنەوەیەکی نیوە مێژوویی و نیوە فەلسەفی بەدەستەوە ئەدەن.

تاسیت (Tacite)مێژوو نووسی رۆمی (55-120ز) کە یەکێك لە بیروڕاکانی ئەوە بوو کە، خاڵ (واتە برای دایك) بۆ خۆشکەزای خۆی وەکوو باوك وایە.

داروین (Darwin)پزیشك و شاعیری بەریتانیایی (1731-1802ز) ئەو بیروڕایانەی کە لە کتێبی "بنەرەتی جۆرەکان (اصل انواع) نووسیویەتی، بوونە هۆی دامەزراندنی قوتابخانەیەك بە ناوی داروینیسم.

دەیوید هیوم (David Hume)(1711 1776ز) بناغەدانەری ئەو قوتابخانە فکرییە بوو کە زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بارودۆخ و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا پیشەسازییەکان دەکرد.

دێکارت (Descartes)فەیلەسووف و ماتماتیکزان و فیزیکزانی فەرەنسی (1596ـــ 1650ز) کتێبە گرنگەکانی بریتین لە: بیرکردنەوەی متافیزیکی، پرەنسیپەکانی فەلسەفەو....

دۆن کیشۆت (Don Quichotte)رۆمانێکی ئیسپانیاییە لە نووسینی سێروانتس کە رەخنەگرتنێکە لە بشێوییەکانی شوالییەگەری، کە لەسەردەمی نووسەردا روو لە ناولبوون بوو.

دورکیم (Emile Durkheim)بەرجستەترین نوێنەری بیروراکانی کۆنت و حاخی رۆشنگەرییە، کە داکۆکی لە رەسەنایەتی عەقڵ و ئازادی بیر کردنەوەو هەروەها دژە کڵێسا بوون دەکات.

رابلە (Rabelais)نووسەرو مرۆڤ دۆستی فەرەنسی (1494 ـــ 1553ز) نووسەری کتێبگەلی وەك، گارگانتووا، پانتا گروێل. رابلە ناسەوارەکانی سەردەمی پێش لە مەسیحییەتی ئەورووپایی تێکەڵ بە ئەندیشە فەلسەفییەکانی سەردەمی خۆی کرد.

رەموولووس(Romulus)بە پێی ریوایەتەکان، بناغەدانەر و یەکەم پاشای رۆما بوو کە لە ساڵی 753تا 715پ.ز پاشایەتی کردووە.

رەموولووس (Ogustal)دواهەمین ئیمپراتووری رۆمای رۆژئاوا کە ساڵی 476ز بەدەستی "ئەداکێر" کوژرا و دەوڵەتی رۆماش رووخا.

ژان ژاك رۆسۆ (Russeau, Jean –Jacques)نووسەر و بیرمەندی فەرەنسی (1712-1778ز) بەمندالی دایکی لەدەست داو، بە هۆی دەسکورتی و هەژاری باوکیەوە ژیانێکی سەختی رادەبوارد. هەموو ژیانی پڕبوو لە نەهامەت و چەرمەسەری و ئەوەش کاریگەری لەسەر بیروراکانی داناوە و کردوویەتی بە ئینسانێکی تووڕە و لە خۆبایی و شەکاك. یەکێك لە کتێبەکانی ئیمێل (Emile)ە کە سەبارەتە بە راهێنان و پەروەردەی منالان و مێرمنالان.

سۆفستایی (Sufestayi)بە مانای بیرمەند، توانا و زیرەك. لە کۆتایی سەدەی 5پ.ز. تاقمێك لە یۆنانـدا سەریان هەلدا کە گەڕان بەدوای حەقیقەتیان بە پێویست نەدەزانی، بەلکوو فێرکاری هونەرەکانیان کردبووە پیشەو قوتابیانی خۆیان فێری دەمەدەقە و موناقەشە دەکرد.

سیتە (Sit)ناوی نەتەوەیەکە کە زۆربەی هاوولاتیانی لە رەگەزی ئاریایی بوون. ئەم نەتەوە لەسەردەمی هەخامەنیشییەکان و پێشتر لەوانیش لە دەوروبەری ئێراندا دەژیان.

سێنت پۆل (San pol)ناسراو بە حەواری نەجیب. یەکێکە لە بناغەدانەرانی نەزمی کلێسایی و باوەڕە مەسیحییەکان و کتێبگەلێکی زۆری نووسیوە.

سیسەرۆن (Sciceron)مارکۆس تولیۆس، گوتە بێژ (خطیب) و سیاسەتمەداری بەناوبانگی رۆمی (106-43پ.ز) لە سەردەمی لاوێتیدا شێعری دەنووسی و سەرقالی وەرگێرانی ئەدەبی یۆنانی بوو.

شارلمانی (charlemagne)(722-814ز) لە سالی 768ز بوو بە جێنشینی باوکی و تا سالی 771ز پاشایەتی کرد.

فۆیـە (Fouille Alfred) یەکێکـە لـە بیرمەنـدە گـەورەکانی هاوچـەرخی فەرەنسا (1812-1838ز) لـە سـەردەمی لاوێتیـدا چاونیشـەی گرت و وای لێکرد نەتوانێت درێژە بە وانەوتنەوە ــ کە پێشتر ئەوکارەی ئەکرد ــ بدات . بـەلام بـەو حاڵەشـەوە هـەموو حـەفتاو چـوار سـاڵی تەمـەنی تـەرخان کـرد بـۆ نووسـین و لێکۆڵینەوە. سەرەتا کەلکی لەبیروڕاکانی ئەفلاتوون و پاشان کانت و کەسانیتـر وەرگرت.

فۆریە (Fourier, Marie charles) فەیلەسووف و بیرمەندی کۆمەڵایـەتی فەرەنسـی (1772-1837ز) سـاڵی 1804 کتێبێکـی لـە ژێرنـاوی "هەماهـەنگی جیهانی" (Harmonic univer) نووسـی و دەیەویست ئامانجەکانی مـرۆڤ بـە ئاقارێکدا ببات کە قازانجی بۆی هەبێت. هـەروەها پێـیوابـوو "کار" تـەنها ڕێگای بەختەوەری و کامەرانی مرۆڤە. فۆریە بەدامەزرێنەری سۆسیالیزمی ئامانـج خـواز (یۆتۆپیسم) دەناسرێت.

فرۆید (Freud)دەروونشیکاری ئۆتریشی (1856-1939ز) لە بنەماڵەیـەکی جوولەکە لە شاری فرایبێرگدا لە دایك بوو. ساڵی 1873 چوە زانکۆ و خوێنـدنی لـە ڕشـتەی پزیشـکیدا دەست پێکـرد و سـاڵی 1881 دۆکتـۆرای وەرگـرت. یەکەم لێکۆڵینـەوەکانی لـەبارەی ئەعسابەوە بـوون. سـاڵی 1895 لەگـەڵ ژۆزێـف بۆرویر کتـێبی "هەنـدێ لێکۆڵینـەوە سـەبارەت بـە هیسـتری"ی نووسـی. فرۆیـد لـەو بـاوەڕەدابوو کـە سەرچـاوەی زۆربـەی نەخۆشـییەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ، ناکـامی سێکسی. تەوتەم و تابۆ یەکێکە لە گرینگترین کتێبەکانی.

فیختـە (Fichte)فەیلەسـووفی ئـەڵمانی (1762-1814ز) لـە ئەڵمانـدا لـە دایك بوە. دایك و باپێکی دیندلری هەبوو و هەمیشە ئەویشیان ئـەبرد بـۆ کڵێسـە. لە 18 ساڵیدا بـوو بـەخوێنـدکاری زانکۆ لـە ڕشـتەی تیۆلۆژیدا. پاشان ئاشنایەتی

لەگەڵ فەلسەفەی کانتدا پەیدا کردو حەزی پێ کرد. کاتێ کە فەرەنسییەکان شۆڕشی مەزنیان دەست پێکردبوو، هەندێ وتاری بۆ پشتیوانی ئەو شۆڕشە نووسی. کتێبە گرنگەکانی بریتین لە: مافی سروشتی، چارەنووسی ئینسان، بونیادی لێکۆڵینەوە لە زانستدا. فەلسەفەی فیشتە لەسەر بناغەی فەلسەفەی کانتدا راوەستاوە.

کانت (Emanuel kant)ئەیلەسووفی ئەڵمانی (1724-1804) لە دایك و باوکێکی مەزهەبییەوە هاتە دنیاوە. هەموو هەشتا ساڵی تەمەنی خۆی بۆ فێرکاری و راهێنان و نووسین تەرخان کرد. بەرهەمە گرنگەکانی بریتین لە: بنەماکانی فەلسەفەی ئاکار، رەخنەگرتنی عەقڵی رەهاو.....

کریستۆف کلۆمب (colomb, christophe)، بەناوبانگی ئەمەریکی (1451-1506ز) ماوەیەکی زۆر بەر لە دۆزینەوەی ئەمەریکا، سەبارەت بە دۆزینەوەی رێگای دەریایی هیندوستان، لەگەڵ بازرگانە ئیتاڵییەکاندا قسەوباسی دەکرد و ئەیەویست دەریاوانی رێگایەکی دەریایی بدۆزێتەوە تاکوو بە هیند بگات، تا ئەوەی کە بەهۆی دامەزران لە دەرباری "کاستیل"دا، توانی سەفەری خۆی بۆ دۆزینەوەی کیشوەری تازەی ئەمەریکا دەس پێبکات. سەفەرەکەی کلۆمب لە 3 نووتی 1492ز دەستی پێکرد و لە چوارەمین سەفەری دا، کە ساڵی 1502 تا 1504 درێژەی کێشا ئەمەریکای دۆزییەوە.

کارلایل ، تووماس کارلایل (1795-1881ز) مێژوونووس و ئەدیبی بەریتانی نووسەری کتێبی "شۆڕشی مەزنی فەرەنسا" و "ژیانی فرێدریکی مەزن"

کالوین ، یووحەنا کالوین (1509-1564ز) لە "لیۆن"دا لە دایك بووە و لە ژنێڤدا کۆچی دوایی کردووە. "ئایینی مەسیحییەت" یەکێکە لەبەرهەمەکانی.

گوستاو لۆبۆن (Gustave le, Bon)(1841-1931) بە هۆی کتێبی "ڕەوانناسی خێڵەکان"ەوە، ناوبانگێکی جیهانی دەرکرد. بەڕای لۆبۆن، کۆمەڵانی خەڵک لە هەندێ بارودۆخی تایبەتدا تووشی نەخۆشی گەلێکی تایبەت دەبن.

لاك (Locke John) فەیلەسووفی بەریتانیایی (1704-1632ز) بیروڕاکانی لەسەر بناغەی بایەخ و بەهای ئیحساس و عەقڵ و بیرکردنەوەیە، کە ئەوانیش دەبێ لە ئەزموونەوە سەرچاوە بگرن. گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە؛ نامەیەك سەبارەت بە لێکبووردن، لێکۆڵینەوە لەسەر عەقڵ و فامی ئینسانی و....

مالتووس (Tomas Robert Malthus) ئابووریزانی بەریتانیایی (1834-1766ز) نامیلکەیەکی سەبارەت بە جەماوەر بڵاوکردۆتەوە کە تیایدا ڕێژەی روو لە زیادبوونی جەماوەری گۆی زەوی نیشان داوەو زیاد بوونی جەماوەری بە مەترسییەکی گەورە بۆ ژیان و شارستانییەتی ئینسان لە قەڵەم ئەدا.

والتێر (volter) فەیلەسووف و نووسەری فەرەنسی (1778-1694ز) یەکێکە لە گەورەترین کەسایەتییەکانی سەدەی هەژدەهەمی فەرەنسا. دووجار لەزینداان خراوەو سێ ساڵیش دوور خراوەتەوە بۆبەریتانیا. "نامەگەلێك سەبارەت بە نەتەوەی ئینگلیس" گرنگترین کتێبیەتی.

هیرۆدۆت (Herodot) مێژوونووسی یۆنانی، کە بە باوکی مێژووناسراوە (486-420پ.ز) لە "هالیکارناس"دا لە دایك بوە. سەرەتا لە شاری "کاری"دا دەستی بە نووسین کرد و پاشان چوو بۆ یۆنان و لە دوورگەی "ئۆلەمپیاد"دا نیشتەجێ بوو. لەوێدا بۆماوەی 12 ساڵ سەرقاڵی نووسینی مێژوو بوو و پاشان لەگەڵ چەند کەسێك لە پەنابەرانی یۆنانی، چوو بۆ ڕۆما و لەوێ کتێبی مێژووکەی تەواوکرد.

## واتای هەندێ زاراوە:

ئانارشیزم (Anarshisme)ڕێبازێکی سیاسی ئاژاوەچییانەیە کە لە وشەی ئانارخیای یۆنانی وەرگیراوە کە بەمانای نەبوونی "ڕێبەرو حکوومەت"ە.

ئایدیالیزم (Idealism) ئەم زاراوە لە فەلسەفە و فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا کەڵکی زۆری لێوەردەگیرێ. لە وشەی فەرەنسی Idee وە هاتووەو بەمانای خەیاڵ و ئامانج دێت و کەواتە ئایدیالیزم دەبێتە ئامانج خوازی و هەروەها گرنگایەتی ئەندیشە و بیرکردنەوە.

ئەندیڤیدوالیزم (Indivdualisme)لە وشەی ئاندیویدیۆ وەرگیراوە کە لە زۆربەی زمانە ئەورووپاییەکاندا بە مانای تاك یان تاکەکەس هاتووە. کەواتە ئاندیویدوالیزم بە مانای ڕێبازی تاکەکەسی دێت کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی وردە بۆرژوازی.

ئۆمانیزم (Humanisme)بریتییە لە مرۆڤ دۆستی. ئامانجی ئۆمانیزم، ئازادی تەواوی خەڵکی زەحمەتکێشە.

بەربەریسم (Barbarism) بە بەر بەو مرۆڤانە دەوترێ کە لەرووی هۆش و بیرکردنەوەوە دواکەوتوو بن و کەواتەبەمانای وەحشیگەری و دواکەوتوویی دێت.

پلۆپۆنیز (Peloponez) دوورگەیەکە لە باشووری یۆناندا کە سەرەتا بە هۆی ناوی دانیشتوانییەوە، "پلاشراپا"یان پێ دەوت و دواتر بە پلۆپۆنزوس ناوبانگی دەرکرد. 20 ساڵ پاش شەڕەکانی ئێران و یۆنان، شەڕی ئەسینا و ئەسپارت لەو ناوچەیەدا ڕوویدا کە بوە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەسینا (341-404پ.ز)

دیالكتیك (Dialectic) بەمانای جموجۆڵی راستییە لە رێگای وتووێژەوە. هەروەها بەمانای گفتوگۆش دێت.

دێسپۆتیسم : حكوومەتی دیكتاتۆری

دێتێرمێنیسم، قوتابخانەی فەلسەفی جەبر بەرانبەر ئیختیار

راسیزم (Racisme)راسیزم یان رەگەزپەرەستی، لە وشەی راس كە بەمانای رەگەزە، وەرگیراوە.

فاناتیسم، دەمارگرژی لە سەر باوەڕ، یان مەزهەب، یان دیدگایەك

فینۆمێنیسم (Phenomesinsme) تیۆرێكی فەلسەفییە كە جگە لە "دیاردەكان" باوەڕی بە هیچ حەقیقەتێكی دیكە نییە. (واتە دیاردە خوازی).

كارتاژ : یەكێكە لەشارەكانی باشووری ئەفریقا (توونسی ئێستا) كە ساڵی 880پ.ز فینیقییەكان داگیریان كرد. لە ساڵی 218 تا 201پ.ز شەڕگەلێكی قورس لە نێوان كارتاژییەكان و ڕۆمییەكاندا رووی دا. ساڵی 698ز عەرەبەكان كارتاژیان داگیركرد و وێرانیان كرد و ئاگریان دا. ئەم وشەیە لە عەرەبی دا كراوەتە" قرطاجنه".

میلیتاریسم (Militarism) بریتییە لە سیاسەتی دەوڵەتە سەرمایەدارییەكان كە لە سەر توندوتیژی و حوكمی سەربازی بەڕێوە دەچێ. هەروەها باوەڕمەندی بەپەكگرتنی سەربازی و دەسەڵاتی سەندیكای سەربازی و گرنگیدان بەكاروبارگەلی سەربازی.

مەكیاولیسم (Machiarelisme) ئەم زاراوەیە لە ناوی "مەكیاولی" نووسەر و سیاسەتمەداری ئیتاڵی وەرگیراوە كە لە كۆتایی سەدەی پازدە و سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا ژیاوە.

یووتیلیتاریزم : فەلسەفەی ڤازانج خوازی و دەس نیشان کردنی ڤازانجی هەموو دیاردە و شتومەکەکان.

## فەرهەنگۆک

| ئینگلیزی | فارسي | کوردی |
|---|---|---|
| Industrialeconom y | اقتصاد صنعتي | ئابووری پیشەسازی |
| Social level | سطح اجتماعي | ئاستی کۆمەڵایەتی |
| Moral - ethics | اخلاق | ئاکار |
| Exchange | مبادله | ئاڵوگۆڕکردن |
| Ideal | آرمان | ئایدیال، ئامانج |
| Value | ارزش | ئەرزش، بەها |
| Fact | امرواقع | ئەمری واقیع |
| Life conditions | شرایط زندگـي | بارودۆخی ژیان |
| Social condition | اوضاع اجتماعي | بارودۆخی کۆمەڵایەتی |
| Archetype | عالي ـ متعالي | باڵا |
| Variable | متغير | بگۆڕ |
| Family | خانواده | بنەماڵە |
| Productiom | توليد | بەرهەم هێنان |
| Participation | مشارکت | بەشداری کردن |
| Socialization | اجتماعي شدن | بەکۆمەڵایەتی بوون |
| Cocialvalue | ارزش اجتماعي | بەهای کۆمەڵایەتی |

| Justification | توجيه | پاساو هێنانەوە |
|---|---|---|
| Psychologism | روانكاوي | پسكۆلۆژی |
| Progress | ترقي - پيشرفت | پێشكەوتن |
| Sacred | مقدس | بەرز |
| Economic Structure | ساخت اقتصادي | پێكهاتەی ئابووری |
| Symbiosis | همزيستي | پێكەوە ژیان |
| Social –status | پايگاه اجتماعي | پێگەی كۆمەلایەتی |
| Social communication | ارتباط اجتماعي | پێوەندی كۆمەلایەتی |
| Violence | خشونت | توند و تیژی |
| Adaptation | انطباق | تەبایی |
| Population Explosion | انفجار جمعيت | تەقینەوەی جەماوەر |
| Amalgamation | اختلاط نژاد | تێكەڵ بوونی رەگەز |
| | | |
| Discrimination | تبعيض | جیاوازی قایل بوون |
| | | |
| Eugenics | اصلاح نژاد | چاكسازی رەگەز |
| Centralization | تمركز | چڕبوونەوە، چەقێتی |
| Concentration | تراكم | چڕێتی |
| Social Stratum | قشر اجتماعي | چینی كۆمەلایەتی |
| Essence | ماهيت | چییەتی |
| | | |
| Prejudices | خرافات | خورافات |
| Plebs | عامة مردم | خەڵكی رەمەكی |
| Mores | آداب و رسوم | داب و نەریت |

| Division ofiabor | تقسيم كار | دابەش كردنی كار |
|---|---|---|
| Tendency | گـرايش | داگەڕان |
| Invention | اختراع | داهێنان |
| Contras | تضاد | دژایەتی |
| Contradiction | تناقض | دژوازی |
| Antisocial | ضد اجتماعي | دژە كۆمەڵایەتی |
| Psychologism | روانكاوي | دەروون شیكاری |
| Institution | نهاد | دەزگا |
| Authority | اقتدار | دەسەڵات |
| Sovereignty | حاكميت | دەسەڵاتدارێتی |
| Intervention | مداخله | دەستێوەردان |
| Nomadism | چادرنشيني | دەوارنشینی |
| Phenomenon | پديده | دیاردە |
| Stagnation | ركود | راوەستان ـ وەستان |
| Publicopinion | افكار عمومي | ڕای گشتی |
| Legitimite | مشروعيت | رەوا بوون |
| Relativity | نسبيت | ڕێژەیی بوون |
| Intelligentsia | روشنفكران | رۆشنبیران |
| Usage | رفتار رايج | رەفتاری باو |
| Structuration | سازماندهي | رێكخستن |
| Social communication | رفتار اجتماعي | رەفتاری كۆمەڵایەتی |
| Reformism | اصلاح طلبي | ریفۆرم خوازی |
| Race | نژاد | رەگەز |
| Social organization | سازمان اجتماعي | رێكخراوی كۆمەڵایەتی |

| Socialhierarchy | سلسله مراتب اجتماعي | زنجیره پله و پایەی کۆمەلایەتی |
|---|---|---|
| Natality | زاد و ولد | زاوزێ |
| Demostration | اثبات كردن | سەلماندن |
| Stabilization | تثبيت | سەقامگیرکردن |
| Pattern | الگـو | سەرمەشق |
| Syndicate | صنف | سەندیکا |
| Repression | سركوب | سەرکوت کردن |
| Industrial revolution | انقلاب صنعتي | شۆڕشی پیشەسازی |
| Civilization | تمدن ـ مدنيت | شارستانییەت |
| Abondance | وفور ـ فراواني | فراوانی |
| pluralism | كثرت ـ كثرت گـرايي | فرەچەشنی |
| virtus | برتري ـ اولويت | فەزیلەت ـ لە سەروو بوون |
| Crisis | بحران | قەیران |
| Sociology | سوسيولوژي | کۆمەڵ ناسی ـ سۆسیۆلۆژی |
| Conflict | كشمكش | کێشمەکێش ـ ناکۆکی |
| Crowd | انبوه خلق، توده مردم | کۆمەلانی خەلك |
| Coods/and/servic es | كالاها و خدمات | کالا و خزمەتگوزارییەکان |
| Conservatis | محافظه كار | کۆن پارێز |
| Slavery | برده داري | کۆیلەداری |
| Banausic | كاسب كار | کاسبکار |
| Social pressure | فشار اجتماعي | گوشاری کۆمەلایەتی |

| Development | توسعه | گەشەسەندن |
|---|---|---|
| Corps | دسته | گرووپ |
| Dependenc | وابسته | گرێدراو |
| Transfer | انتقال | گواستنەوە |
| Compulsion | اجبار | گوشار، جەبر |
| Isolation | انزوا | گۆشەگیری |
| Totality | کلیت | گشتێتی |
| Transformation | تبدیل شدن | گۆڕان |
| Social deviation | انحراف اجتماعي | لادانی کۆمەڵایەتی |
| Configuration | هيئت - انجمن | لیژنە |
| Survie | بقاء | مانەوە |
| Class struggle | مبارزة طبقاتي | ململانێی چینایەتی |
| Method | روش | میتۆد، رەوش |
| Heterogeneity | ناهمگوني | ناهاوجەشنی |
| Elite | سرآمد، برگزيده | نوخبە |
| Social order | نظم اجتماعي | نەزمی کۆمەڵایەتی |
| Norm – Normative | هنجار ـ هنجاري | نۆرم ـ نۆرماتیڤ |
| Dependency | وابستگي | وابەستەیی |
| Class consciousneess | آگاهي طبقاتي | وشیاری چینایەتی |
| Reproduction | تجديد نسل، تناسل | وەچە خستنەوە |
| Intermediarie | واسطه ـ رابط | واسیتە |
| change | دگرگوني، تحول | وەرگۆڕان |
| Consanguinity | همخوني | هاوخوێنی |
| Homogeneity | همگوني | هاوجەشنی |
| Extrapolation | استنتاج قياسي | هەڵێنجانی |

| | | بەراوردکارانە |
|---|---|---|
| Factor | عامل | هۆکار |
| Social eguilibrium | تعادل اجتماعي | هاوسەنگی کۆمەڵایەتی |
| Aleatory | تصادف - اتفاقي | هەڵکەوت |
| Syncretism | همفكري | هاوڕایی |
| | فرازونشيب، نوسان | هەڵکشان وداکشان |
| Legislation | قانونگـذاري | یاسادانان |
| Conformism | يكنواختي - يكساني | یەکڕەوتی |

## بەرهەمەکانی وەرگێڕ:

1 هەشت نامە ــ گۆنتەرگراس، کینزابورۆئە ــ لەگەڵ شۆرش جوانرۆیی ــ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ــ 2002

2- فێربین چۆن بەسەر ترس و دڵەڕاوکێی خۆماندا زاڵ بین ــ جۆرج ماربارن ــ لەگەڵ شۆڕش جوانڕۆیی ــ بنکەی ئەدەبی گەلاوێژ ــ 2002

3- نامەیەك دەربارەی لێکبووردن ــ جۆن لۆك ــ لەگەڵ شۆڕش جوانڕۆیی ــ خانەی وەرگێڕان ــ 2004

4- تێگەیشتنی تیۆرە سیاسییەکان ــ تووماس ئسپراگێنز ــ (لەژێر چاپدایە)

5- کورتە مێژوویەکی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵناسی ــ بوتول ــ (ئامادەی چاپ)

6- فەرهەنگی زاراوەکانی فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان ــ ئینگلیزی ــ فارسی ــ کوردی (ئامادەی چاپ)

7- فیمینیزم ــ جیەن فریدمەن ــ(ئامادەی چاپ)